**ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە «کەژاڵ خدر»**
**ئەو ئافرەتەی لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، لە کۆمەڵگای پیاوسالاری کورددا لوتی بڕدرا**

ئەگەر بونیاد ودەرکەوتنی ئایینەکان لەسەر بونیادی ڕاستی بوووبێتن و لە پێناوی بەختیاری و سەرفرازی مرۆڤ و دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا هاتبێتنە بوون، کەواتە لە ئایینەکان پیرۆزتر (ڕاستی ووتنە). بەم پێیە هەر ئایینێ دژی ڕاستی ووتن بێ .ئەوە دژایەتی کرۆکی خۆی دەکات. (گەر ڕاستی بونیادی بێ)؟.

لەبەر ئەوەی لەکرۆک و بونیادی ڕاستیدا بزوتنەوەیەکی بێ ئۆقرە هەیە کە هەمیشە بە دوای ڕاستر و ڕاستردا دەگەڕێ بۆیە لۆژیکی ڕاستیی چاو لە هەڵەی هیچ ئایین و فەلسەفە و کەسێک ناپۆشێ! .

بەهیوای ئەوەی ئەم ڕۆمانە ، پرسیارە سڕبووەکانی مێشکی مرۆڤی هەژاندبێ.

جەزا چنگیانی

# ووتــەی پێشی

دڵنیـــام لەوەی دوای بڵاوبوونەوەی ئەم ڕۆمـــانە ڕەخنەم لێـــدەگـــیـــرێ کەسـانێکیش هەن زویردەبن. ئەو ڕەخنانەی هەڵەیەکم بۆ ڕاست دەکـەنەوە ڕێزیان دەگرم و زوویرەکانیش دەبێ ئەوانەبن کە ڕاستیـان بۆ هەزم ناکری و کۆنزەرفاتیفانە لە ژیان دەڕوانن ، بڕوایان وایە دەبێ یاساو نەریتە پیرۆزە چەند هەزار ساڵ کـۆنەکـان بەپیـرۆزی بمێننەوە. من و ئەم ڕۆمـانە و ئەوان خـاوەنی دوو دیدی جـیـاوازین بۆ ژیان و بەخـتـیـاری مـرۆڤ، بۆیە لە زویربوونیان دڵنیام .

ئەرکی نووســەر و ڕۆژنامــەنووس ، پێش ئەوەی ئەرکـــێکی ئەدەبی و ئیستاتیکی و ڕۆشنبیری بێت ، ئەرکێکی مرۆڤایەتیە . یانی نووسەر و ڕۆژنامەنووس . پێش ئەوەی نووسەر و ڕۆژنامە نووس بن ، دەبێ مرۆڤ بن مرۆڤ بوون تەنیا بەمانا بایەلۆژیەکەی نا ، بەڵکو بە بونیادە فەلسەفی و ڕۆحـیـەکـەی . من لەم ڕۆمـانە و لە بەرهەمـەکـانی ڕابردوو و ووتار و ڕیپـۆرتاجەکـانمدا، هەمیشە پەیڕەوی یاسایەکم کردووە کە پێی دەڵێن ڕاستی. بە دڵنیایشەوە لە داهاتووشدا هەمان ڕێچکە بەرنادەم.

چۆن بە پێی یاسای لۆژیک و سروشت، هەمیشە نوی دژی کۆن لەڕیفۆرم و گۆڕاندایە ، ئاواش پێویستە نووسەر و ڕۆژنامە نووس، دژی یاسا ونەریتە کۆنزەرفاتیفە چەوسێنەرەکان بن و لە میکانزمی کۆمەڵگادا ڕۆڵی گرنگ ببـینن و پەردە لەسـەر ئەو بابەتانە هەڵبـدەنەوە کـە بۆتە هۆی وونبـوونی حقیقەتەکان و نامۆ بوونی مرۆڤایەتی . زۆر شت بەر یاسای گۆڕانکاری کـەوتوە بەڵام ( دین ) وەک ئایدۆلۆژیەتێکی کـلاسیـکی کـە لە ئاسـتی پێداویستی سەردەمە کۆنەکاندا هاتونەتە بوون و تا ئیمڕۆمان وبە بیانوی پیرۆزبوونیانەوە وەکی خویان ماوەنەتەوە (بێجگە لە ڕیفۆرمەکەی مارتین لۆتەر)ی ئەڵمـانی نەبێ ، پیــرۆزبوونی هەر فــەلســەفــە و ڕێبــازو ئایدۆلۆژێتێک وکەسێک یانی داڕشتنی بونیادی سیستەمی دیکتاتۆریەتی (مەزهەبی و ئایدۆلۆژی و تاکەکەسی ) کە بەهۆیەوە مرۆڤ ئازادی لەدەست دەدا و ئازادی مرۆڤیش بەنرخترین سەرمایەی ژیانەو پێویستە هەموو کەس

هەبێ .
تا ساڵی بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆمانە، ساڵی ( ١٩٩٩ ) میلیۆنان مرۆڤ بڕوایان وایەکە عیسا کوڕی خوایە، من لەم ڕۆمانەدا دەڵێم وانیە، عیسا کوڕی خوا نیە، بەڵکو وەکی هەموو مرۆڤێکی تری ئەم سەرزەمینە کوڕی سروشتە یانی بەری سێکسی (ئافرەت و پیاوێکە) ودایکی ناوی مریەمە، هەر پیاوێک باوکی بێ و هەر ناوێکی هەبێ بەلای مرۆڤی مرۆڤ دۆستەوە نابێ گرنگ بێ، گرنگ ئەوەیە عیسا چی بۆ مرۆڤایەتی هانیوە؟ مەبەستیشم لەم ووتەیە لەکاویکیردنی پاکیزەیی مریەم خان نیە دەکرێ مریەم خانیش قوربانیەک بێ لەو ملیۆنان ئافرەتە قوربانیانەی یاسای پیاوبێ لە مێژوودا. عیسا پیاوێکی هوشیار و شۆڕشگێرێکی سەردەمی خۆی بوو، لە پێناوی یەکسانی و خۆشەیستی وداپەروەری کۆمەڵایەتی ونەمانی چەوسانەوە و نەهێشتنی برسێتیدا خەباتی کردو ئەمانە نرخی عیسایان دروست کردووە نەک (باوکی). ئەگەر عیسایەکان ئەم ڕاستیە (تابۆ) بکەن ئەوە با بزانن دژی ویست وفکری عیساو بونیادی کریست کاردەکەن کە (ڕاستی ووتنە). عەرەبەکان بە قۆناغی پێش ئیسلام دەڵێن (جاهلیەت) یانی پریمێتیفیتیەت. لەم قۆناغەدا محەمەد دژی یاساو نەریت و خووی ئەو کۆمەڵگایە بەکەڵک وەرگرتن لە مامۆستا کوردەکەی (صفا ازر) کە لەمیژوودا بە برایم ناوی هاتووە ، محەمەدیش ئەم مامۆستا بوونەی برایمی لە پەڕاوە بەناو بانگەکەیدا قورئان لە سورەتی (النساء) ئاماژە بۆکردوە ومحەمەد لەسەرەتای شۆڕشەکەیدا ڕیفۆڕمێکی کۆمەڵایەتی کرد ،کەتێیدا هەندێ مافی پێشێلکراوی ئافرەتی، وەکی بەشیان لە میراتی و مارەیی و قەدەغەکردنی زیندە بەچاڵکردنیانی پیادەکرد، بانگی ئازادی و برایەتی هەڵدا، بەڵام کاتێک شۆڕشەکەی پەرەی سەند و لەسنوری چاوەڕوانکراویان پەڕیەوە وناوچەی قەڵەمڕەویان فراوان بوو، لەئەنجامی داگیرکردنە ئیسلامیەکانیشدا سامانێکی فراوانیان چنگ کەوت محەمەد وشۆڕشەکەی، لە ڕزگارکەرەوە بوون بەداگیرکەر و لە دادوەرەوە بوون بە چەوسێنەر لەگەڵ پەیدابوونی هێز و فراوانی دسەڵاتی عەرەب (بیر و هەستی نەتەوەایەتی بە شێوە ڕەگەز پەرستێکەی) لەناو عەرەبەکاندا پەرەی سەند خودی محەمەدیش کە هەموو ووتەیەکی دەبووە یاسای ئەوسەردەمە

لەو قۆناغەدا بەم ووتەیەی (انصر اخاک ظالما او مظلوما ) شەرعێتی بەو زوڵمە دەدا بەرامبەر بەنەتەوەکانی تر و بەپێی سورەتی (الانفال) یش بەناوی خواوە ئەو تالآنی و دزیانەیان حەلآلکردکە لە جەنگەکانیان دەستیان دەکەوت. ئەم سورەتی (الانفال)ە بەشیوەیەک سەربازان وسەرانی ئیسلامی هارکرد کە کۆنترۆلی ڕۆحی و موراڵی مرۆڤایەتیان داتەپا و لەمرۆڤە بون بە ئامیرێکی کوشەندە و ئاژەڵێکی دڕندە. بەشێک لە دەستکەوتەکانی ئەو جەنگانە ئافرەت بوون، (بازرگانی ئافرەت ) لە پێش ئیسلامدا بەشێکی گرنگی کولتوری بازرگانی عەرەب بوو، بۆیە محەمەد نەیتوانی بەرنگاری ئەم بازاڕە ببێتەوە ودەیزانی لە شۆڕشەکەی بەردەوام نابێ ئەگەر دژ بەوبازاڕە بێ، بۆیە محەمەد بە سورەتی (الانفال) و لەشکرکێشیەکەی بۆ سەر ناوچە و وولآتانی نائیسلام و تالآنکردنیان خزمەتێکی گەورەی بە بازاڕ و بازرگانانی قورەیش کرد. ئەم زوڵم وزۆر و تالآنیکردنە بۆ سەربازانی ئیسلام بوو بەپیشەیەکی گرنگ و زوربەشیان بۆ هەمان مەبەست زۆر دڕندانە شەڕیان دەکرد( ئەگەر کوژران دەچنە بەهەشت و ئەگەر زیندوو مانەوە دەبنە خاوەن سامان وکۆمەڵە ئافرەتێ ). لە پاشکۆی هەموو لەشکرێکی ئیسلامدا کە دەچون بۆ داگیرکردنی ناوچەیەکی نائیسلام دەستەیەک لەبازرگانانی قورەیشیان لەتەکدابوو، تەنیا بۆکڕینی دەستکەوتەکانی ئەوجەنگانە(ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونی چۆکدادانی بونیادی فکری ئیسلامە بەرامبەر بەبازاڕ). خودی محەمەدیش لە دوای هەموجەنگێ ،لەناو ئافرەتە بەدیلگیراواندا گەنجترین ئافرەتی بۆخوی هەڵبژاردوە لە دوای یەکەم ژنی محەمەد (خەدیجە)، کە بێوەژنێکی خاوەن سامان و بەتەمەن بوو و لەبەر سامانەکەی هێنای، لە یەک کاتدا (٩)ژنی هەبووە وەک: (عائیشە ، حەفصە ، سودە ، زینەبە ، ئوممی سەلەممە ، ئوممی حەبیبە ، مەیمونە ، جووەیرەیە ، صەفیە). ئەم ژن هێنانەشی دوور بوو لە هەموو بەهاو پرێنسیپێکی مرۆڤایەتی، بۆ نمونە تەمەنی عائیشە (٩) ساڵان بووە محەمەد (٥٤) ساڵ . لە ڕۆژی زەماوەندەکەیاندا عائیشە ئەوەندە منداڵ بووە ، بووکەشووشەی منداڵی بەباوەشەوە بووە.

× زەینەب ژنی زڕکوڕەکەی بوو، لە چاوپێکەوتنێکیدا حەزی لێکرد و بە تەلآقدانیدا ودوایی لەخۆی مارە کرد.

× صفیە ژنە جولەکەیەکی شۆخ بوو، لە تالانییەکانی شەڕی خەیبەردا بەر سەربازێکی ئیسلام کەوت ، محەمەد لەبەر جوانیەکەی بە حەوت سەر حوشتر لە سەربازەکەی کڕییەوە. لەگەڵ ئەم (٩) ژنەشدا دوو کەنیزەکی هەبووە ،(ماریا)ی فەلە و(ڕێحانی) کورد . بەپێی یاساو کولتوری ئەو سەردەمەی عەرەب ، خاوەن ( کۆیلە و کەنیزەک )بۆیان هەبووە کۆیلە بخەسێنن و سێکسیش لەگەڵ کەنیزەکدا بکەن . خوا، لەم ڕۆمانەدا دەڵێ دەبێ ئەم زەمینە نیشتمانی گشت مرۆڤایەتی بێ (نابێ ڕەنگ و ڕەگەز و ناسیونالستی) ببنە لەمپەر لەبەردەم ئازادی مرۆڤدا مادامێکیش سروشت دروستکەری (ئافرەت و پیاوە) ، دروستبوونی ئەم دوو (بوونەش) لە دەسەڵاتی (خود) دا نیە ، کەواتە دەبێ ئەم جووتە: (ئافرەت و پیاو) مافەکانیان وەکی یەک بێ . لەم ڕۆمانەدا خوا لەسەر دادوەری و نادادوەری ڕەخنە لە ئاینەکان و ڕابەرەکانی ، محەمەد و باریم وعیسادەگرێ .
ئەم ڕۆمانە کۆمەڵە ڕوداوێکی مێژوویی یەو بە شێوەیەکی ئەدەبی ئیستاتیکی دەیگێڕمەوە ، بەهیوای ئەوەی توانیبێتم پرسیارە سڕبوەکانی مێشکی مرۆڤم هاژاندبێ .

**چنگیانی**

سەرەتای زستانێکی تەڕ بوو، تەمێکی تەڵخ دەروونی شاری گرتبوو. تەمی بێکاری وغــوربەت وتەنیــایی وتەمی تەڵخی دەروونی شــار دەروونی داوەشاندبوون هەر ئەم بێکار نیە، سوپایەکی بێکار ڕژاونەتە سەر شەقام و کونجی بارەکان.. ناونیشانی ڕۆژنامەو بابەتی گرنگی گـۆڤــارو مــیـدیا وچەلەحـانێی حکومـەت وئۆپۆســزیۆن و پەرلەمـان زۆرانگرتنی مۆتەکەی بێکاری بوو. هیچ لایەکیـان توانای بەزاندنی ئەم مـۆتەکـە ترسناکـەیان نەبوو. بێکاری ببــوە زەنگێکی ترسناک، خورپەیەکی دڵگوشین ، دڵی سەرجەم دانیشتوانی کاردارو بێکاری گرتبوو.

ئەم کـوڕی بەزم وڕەزمی خـواردنەوەو بارِ نەبوو تا بەهۆی مـەسـتـیـەوە سامی بێکاری و نەگبەتی و غوربەت وتەنیایی ڕابماڵێ. کە لە خەو و تەنیــایی و ژوورەکـەی و خـوێندنەوە بیــزار دەبوو، سنگی شـەقـام و بزنەڕێی ناودارستانەکان و پیاسەی ناوباخچەکانی هەڵدەبژارد و ڕۆژ

وکاتەکانی دەدا بەدەم شەپۆلی پیاسەی نەبڕاوەی تەنیایی یەوە. چاو و مێشکی هوشیاری، هێزی بڕینی سنووری وڵاتانی دنیاشی هەبوو، بۆیە ڕووداوەکانی دنیاشی، وەک کۆمەڵە ئەڵقەیەکی لەیەک نەپچڕاوی زنجیری کارەساتێکی مرۆڤایەتی بەیەکەوە دەبەستەوە. لە هەر وڵاتێک کارگەیەک دابخرایە، ئەم لە ژوورەکەی خۆیەوە غەم دایدەگرت و هەستی بە قەبەبوونی کێشەی خۆی وگشت کرێکارانی جیهان دەکرد. لە وڵات مامۆستا بوو، لێرە کرێکار، وەلی کرێکارێکی هوشیار.

پێش ئەوەی بچێتە ناو پێخەفەکەیەوە، کاتژمێرەکەی خستە سەر شەشی بەیانی و دەستی لە ملی هیواکانی کردو خەوی لێکەوت خەوێکی غەماوی وپڕ لە دڵە خورپەیەو پچڕ پچڕ و دوودڵی و بزرکاند و وورێنە.

لەگەڵ لێدانی یەکەم زەنگدا لە خەوە ئالۆسکاوەکانی ڕاپەڕی.. ڕیشی پاک تاشی ، دووشێکی گەرمی کردو کراسێکی پاکی ئوتووکراوی لەبەرکردوو و بۆینباخێکی جوانی بەست و یەکەم کەس بوو خۆی گەیاندە دەرگای ئەو کارگەیەی کەچەند جێگەیەکی بەتاڵی کاریان لە ڕۆژنامەیەکدا بڵاوکردبۆوە. پێش ئەوەی لەدەرگای سکرتێری کارگەکە بدا، وەک خۆی بۆ تاقیکردنەوەیەکی گرنگ ئامادە بکات، بوێنباخەکەی ڕێکخست، دەستێکی بە برۆکانیدا هانی ، چاویلکەکەی لە قۆقزیی لوتی بەرزکردەوەو خستییە بەر چاوەکزەکانی و قورگی بۆ قسەکردن سافکرد . ترپەی لێدانی دڵی کەمێک کەوتنە پەلە.کە بە ئەسپایی لە دەرگاکەی دا، ناسکۆڵەدەنگێ لەو دیو دەرگاکەوە فەرمووی لێکرد بەئاستەم و وریاییەوە دەرگاکەی ترازان و پێش ئەوەی هەنگاو بنێتە ژوورەوە، سەری کرد بە درزی دەرگاکەدا.. ئافرەتێکی قژ زەردی ناسک و چاوگەش و باریکەلە لەبەردەم مێزو کۆمپیوتەرێکدا دانیشتبوو بەقردێلەیەکی ڕەش ، قژە زەردە خاوەکەی لە دواوە گرمۆڵەکردبوو و بلوسێکی ڕەشی تەنکی سنگکراوەی لە

بەردابوو لامل وسەرسنگ وگەردنێکی جوانی دەرخست بوو. جووتێ مەمکۆڵەی قنج لەژێر بلوسەکەیدا خپ ببوون و ناسکە درزێکی کاڵی لەنیوانیادا دروستکردبوو. لێوەکانی بەرەنگێکی سووری تۆخی مەیلەو قاوەیی ڕەنگکرابوون .ڕوویەکی نەرم و دووچاوی گەشی ئارام دوولێوی تازە ڕەنگکراو، وێنەی دەروونێکی بەختیارو بێگرفتی دەنواند. پێش درکاندنی یەکەم وشەی ویستی، حەزی بە جوانییەکەیدا چزا.

بە چەند هەنگاوێکی کورت چووە بەردەم مێزەکە، بە میهرەبانی و زەدەخەنەوە بەیانی باشی لێکرد.

سکرتێرەکە بەهاتنە ژوورەوەی ئەو، ڕووی لە کۆمپیوتەرەکە وەرگێڕاو چاوێکی خێرای بەسەرو قەڵافەت و جل وبەرگ و ڕوویدا گێڕا بەزەردەخەنەیەکی ئەکتەرئاساوە ڕووی تێکرد و بەیانی باشەکەی بۆ سەندەوە:

ـ فەرموو کارێکت هەیە؟

وەک سەربازێک چۆن بەرامبەر ئەفسەرێکی دڵڕەق دەوەستێ و چاوەڕێی بڕیارێکی چاوەڕوان نەکراوبێ، ئاوا لەبەر دەم مێزی سکرتێرەکەدا وەستابوو. هەردوو دەستی بە ڕۆژنامەیەکی لوولکراوەوە لە پێشەوە ڕەقکردبوو.

میهرەبانی و بەزەیی تێکەڵاوی چاوەکانی کردو ملی نا بەلاوە ووتی:

ـ بەڵی هاتووم بۆ پرسیاری ئەوکارانەی کە دوێنی ئێوارە لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوتان کردۆتەوە.

سکرتێرەکە جارێکی تر چاوی بە جل وبەرگ و سەروسیماو ڕەنگی تۆخی و قژە ماش و برنجییەکەیدا هێنا، وەک ئەوەی بڕیارێکی ئامادەکراو لە سەر زمانی تۆمارکرا بێ پێی ووترابێ، بێبیرکردنەوە ووتی:

ـ ببوورە هەموو شوێنەکان گیراون.

بروسکەیەک لە دڵی داو ڕەنگی ڕووی تۆخ هەڵگەڕاوناودەمی کەمێک

ووشک هەڵهات، ڕۆژنامەکەی دەستی بەرزکردەوە وتی:
ـ خانم، دوێنی ئیواریێ ئەم کارانەتان لەم ڕۆژنامەیەدا بڵاوکردۆتەوە، بڕواش ناکەم کەسێک لە من زوترهاتبێ؟.
سکرتێرەکە بەهێز و کەشخە و دەنگێکی گەرمەوە وتی:
ـ وتم ببوورە هەموو کارەکان گیراون!
ئەمەی ووت و ڕووی بەلای کۆمپیوتەرەکەدا وەرچەرخاند و پشت گوێی خست.
ئەمە یەکەم جار نیە ڕەنگی هیواکانی لە یەکەم پرسیارەوە زەرد هەڵدەگەڕێ. بە کزی و بێ هیواییەوە ڕووی وەرچەرخان و بیرۆی سکرتێرەکەی بەجێهێشت بەدەم وڕێنەی ڕێگاو بێحەوسەڵەییەوە ورد ورد شەقامەکانی دەبڕی و دڵی لە نیوان بەرداشی گرفتی بێکاری و ژیانی تەنیایی وغوربەتدا توابۆوە. بۆنی قاوەخانەیەک ئارەزووی قاوەیەکی گەرم وشیرینی هەڵسان وئاوڕێکی دایەوە گیرفانی بەتاڵی زریکەی لە ئارەزووی هەڵسان و دەمی حەزەکانی نووقاندو وەڵامی ئارەزووەکانی خۆی دایەوە.
(قاوەیەک (٤) مارکە و خواردنەوەشی بە تەنیا تامی نیە! )
ملی ڕێگەی گرت و تا لە قاوەخانەکە تێپەڕی هەوای ئەو ناوەی هەڵنەمژی.. بەدەم ڕۆیشتنەوە خۆی بە باخچەیەکداکردو لە سەر کورسیەک دانیشت. لەناو گرفت و حەز وئارەزووەکانیدا گینگڵی دەدا.
(چی منی بەم وڵات و کۆمەڵەوە بەستۆتەوە؟ وا تەمەنێکە لەم شار و کۆمەڵەدا دەژیم ، هاوڕێیەکم نیە غەمەکانم لەتەکدا تاوتوێ بکات.. دۆستێکم نیە دەستی ئازارەکانم بگرێ وکەمێک تۆزی غوربەت لەچرکەکانی ژیانم بتەکێنێ.. لەشارێکدا دەژیم دانیشتوانەکەی یەک ملیۆنە و کەچی من وەک لەبیابانێکی چۆڵدا بژیم تەنیام، هێندە تەنیام گەر لەبەر خۆمەوە قسەنەکەم بەمانگێ وشەیەک لەزارم نابیستم.هەروەک سواڵکەر، چەندین جار زەردەخەنەم کردووە بەکلیلی

پەیوەندی و بەرووی خــەڵکی ئەم شــارەمــدا پژاندووەو کــەســێک وەڵامێکی بەسۆزی نەداوەمەتەوە؟ هەموو کەسم خۆشدەوێ کەچی کەس نیە سۆزێکم بداتێ. من حەزم بە یارمەتی هەمووکەسێکەو کەسێک نیە لایەک لە نەگبەتیم بکاتەوە. لەم شارو وڵاتەدا هەست بە دەعبا بوونی خۆم دەکەم نەک مرۆڤ .)

دەستێکی بە روویدا هێناو وێنەی ڕوخساری لە ئاوێنەی هەستیەوە هێنایە بەرچاوی خۆی.

ڕوویەکی زیبکاوی قوپاو.. جێ زیبکە کۆنەکانی لە کونی کۆمەڵە بزمارێکی هەڵکەنراوی تەنەکەیەکی خۆڵی ژەنگاوی قوپاو دەچێ، چاوێکی کزو چاویلکەیەکی قەبە،لووتێکی قۆقزو خوار، پێستێکی قاوەیی و سەروقژێکی ماش و برنجی ، تەمەنێکی (٤٠) ساڵەیی، لەم کۆمەڵگا بیرۆکراتیەدا چۆن شانسی بۆ کار و پەیوەندی ڕۆحی و ئافرەت دەبێ!؟

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سەیرێکی ڕاست وچەپی خۆی کرد.

کێ گوێی لەدەنگی دەروونی تۆیە؟ .کێ ئاگای لە حەزی سوتاوی ڕۆحی داتەپیوی تۆیە؟. لە وڵاتیش هەر داماو بووم، کەسێک نەبوو سۆزێکم بداتێ لەدایکم زیاتر... ئۆف دایە گیان.. تەنیا ئافرەتێک بوویت باوەشت پێدا دەکردم و خۆشەویستیت دەدامێ.. چەند میهرەبان بوویت.. بێزت لە زیبکە تەقیو و زەردو وشک هەڵهاتووەکانی ڕووم نەدەکردەوە. ئاخ ئەم زیبکانە چۆن لەو ڕۆژەوەی حەز لە دڵماچەکەرەی کردووە وەک پۆلە زەردەواڵەیەک لە ڕووم ئاڵاون و هەر ڕۆژە چزە لە لایەکم هەڵدەسێنن. ئۆف دایەگیان چەند خۆش بوو کەپێت دەوتم:

(کوڕم خەفەت مەخۆ، نیشانەی باڵق بوونتە، ماوەیەکی تر پێستی ڕووت ساف و جوان دەبێتەوە.)

ئای دایە گیان، نەتدەزانی ئاسەوارەی ئەم زیبکانە چۆن ڕووم سەقەت دەکەن .. لە دوا کاتی ماڵ ئاوایی وسەرهەڵگرتن و سەفەری بێ

هیـوایشدا بوو، چۆن شەوبۆی خوشکم برینداری کردم، لە ترسی ئەوەی ڕووی زیبکاوی نەبێ، لە جـیاتـی ماچ و باوەشی خوشکانەی، تەنیـا سەری پەنجەکانی خستە دەستمەوەو ئاگام لێ بوو، دوای ئەو تەوقـە سـاردو سڕە قـیـزاوییـەشی بە شـەرم و دزییـەوە سـەری پەنجـەکـانی بەکراسەکەی سڕی٠مانگێ ساڵێ.. دووان. سیان، ڕۆژانە لەم شارو وڵاتەدا تەنیام .. ئاخ خوایە بۆ وام لێهات! چ چارەنووسێک بوو!! وا بووم بە (٤٠) سـاڵ و بێـهـاوسـەرم.. بێ منالـم.. بێ غـەم خـۆرم.. بێکارم.. بێ لانەیەکی گـەرمم.. بێ هاوڕێم بێ نیشـتـمـان و دوور لە هەمـوو شـتـە خـۆشـەکـانی ژیانم. ئەمـە ژیانی ئەوروپایە!، خـواردن نووستن.. نووستن ، خواردن و چوار دیواری ژوورەکەم و تەلەفزیۆنێک و کۆمەڵێ پەرتووکی کۆن.)

قوڵپی گریانێکی سەخت وەک بورکانێکی بەجۆش دەروونی داگیرکرد. پێش ئەوەی هەژانەکـەی بگاتە لوتکەی چاوەکـانی، ناخی تەقـیـەوەو قوڕگ و دەروونی گەرم داهات:

ـ کێ هەیە لەم دنیایەدا منی خۆش بوێت؟

ـ کەس ....!

ئاخ.. یەک کەس هەبوو ئەویش ، بێئەوەی بۆنی دواهەناسەی هەڵمژم مرد.. ئۆف دایە گیـان چەند مهـرەبان بوویت.. منیش چەند سپـڵە و خـۆپەرست بووم وام دەزانی ئەوروپا گـرفـتـەکـانی ژیان و زیبکەکـانی ڕووم سارێژ دەکات و وەک مرۆڤ تێم دەڕوانن و دەبم بەخاوەنی هەموو پێویستییەکانی ژیان٠

ـ بەجێم هێشتی لە کاتێکدا دەبوایە تا دوا هەناسەت لەلات بوومایە٠ دیمـەنی دوا دیداری ومـاڵ ئاوی لەگـەڵ دایکیـا هانیە یاد وچاوەکـانی نوقاند.

ـ کوڕم بۆ کوێ دەڕوویت؟

ـ نازانم دایە گیان!

ـ ئەم سەرهەڵگرتن و کۆچە بێ سەروشوێنە بۆچی؟ کوڕم ئارام بگرە..

خوا گەورەیە .
ـ دایە گەورە و بچوکی خوا گرفتەکان چارەسەرناکات!. لەم وولاتەدا سیاسیە قاچاخچیەکان و بازرگانانی چەنگ حوکم دەکەن.. ئێرە شوێنی ژیان نیە!.
چاوەکانی زیاترکردەوە.. سەری لەسەری دایکی نزیک کردەوە:
ـ دایە گیان، تا ئەمانە لەم وولاتەدا هەناسە بدەن، ئەم بازاڕو مەزادخانە خوێناویە هەر دەمێنێ!.
ـ بۆ کوێ؟؟
ـ خۆشم نازانم.. بۆ ئەو شوێنەی وەک مرۆڤ لێم دەڕوانن..بۆ شوێنێک بوونی وونی خۆمی تیابدۆزمەوە، یانی ئازادبم . دایە گیان مرۆڤ کە ئازاد نەبوو وونە . وونە لەخوودی خۆی، لە کۆمەڵ، لەسروشت، لە بوون، لە هەمووشتێک ، ڕەنگە لێم تێنەگەیت، وەلی ئەمە گرفتی منە . من نامەوێت بە نامۆی و وون بوون بمرم .من نامەوێت پرسیارەکانی ژیانم لە مێشکمدا کەڕوو هەڵبهێن. ، لێرە پرسیار حوکمی چەقۆی لەسەرە ، دەڕۆم بۆ شوێنێک خۆشم نازانم کوێیە. وەلی دەبێ لێرە جیاوازبێ، چونکە من بەدوای ئەلتەرناتیفدا دەگەڕیم ، ئەلتەرناتیفێک کەخۆمی تیا بدۆزمەوە، وەک مرۆڤ، ئا وەک مرۆڤ، نازانم چیم بەسەردێ، دەبێ بڕۆم ، ئەمە سونەتی ژیانی منە، دڵم دەتەقێ قسەنەکەم، مێشکم دەجەمێ پرسیار نەکەم.
ـ کوڕم لە وولاتانی غەریبی ژیان ئاسان نیە .
ـ دایە گیان ڕاستە دەشێ زۆر سەخت بێ ، وەلێ تاقە ئەلتەرنارتیفە بۆ ئەم ژیانە زوخاوییە .
ئاوڕێکی بەچواردەوری خۆیدادایەوە:
(گەیشتمە ئەورووپاش کەسێک حسابی سەگێکم بۆ ناکات.)
چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو.
(دەبێ بگریم تا دەروونم ئاسودە بێ، دەگریم تا دوا تنۆکی فرمێسک وشک دەکات.. دەگریم و دەگریم، ئاخ گریان چۆن بوو بە بەشێک لە

بەرنامەی ژیانی تەنیایی و نەگبەتیم!! ئیمشەو چی بکەم؟ لەگەڵ کێدا بدوێم؟ بەتەنیــا چیم لێ دێ؟ لە کــوێی؟ لە نیــوان چوار دیواری ژوورەکــەمــدا، لە بەرامــبــەر تەلەفــزیۆنێکی بێــدەنگ و وێنە هەڵواسراوەکانی هاوڕێیانی شاردا!!. )
لەپی دەستەکانی لەیەک خشاند و لەپی دەستی ڕاستی یەکالا کردەوەو بەرامبـەر ڕووی خۆی ڕایگرت و وەک لەتەک هاوڕازێکیـدا بپەیڤی کەوتە پەیڤین لگەڵ دەستیدا .
(تاکـەی گـڕی ڕۆحم دادەمـرکـێنیـتـەوە؟دەزانم تاوانی تۆ نیـە؟ تۆش حەزت دەکرد دڵی پەنجەکانت گۆپکەی کیژۆڵەیەکی ناسکی ختوکە بدایە، شلکەی نەرمـۆڵەی مـەمکی قـەیرەیەکی گـڕاویت لە مـشت بگرتایە.دەزانم ڕۆحت وەک ڕۆحی من تینوی بۆنی توکی بنبـاخـەڵ وبەرموسەلانی ئافرەتێکی خرپنە . ئەی وایە تۆ، پارچەیەک لەمنی، تۆ جۆگەیت و تەزووی حەز دەڕژێنیتە ڕۆحمەوە . دەبێ چ تامێکی هەبێ، دوولێوی ناسک وناودەمێکی گەرم بۆت بمژێ؟ ئا ، دڵی پەنجەکانت بمژێ !
(نازانم لە ژیانما نەمچەشتوە، دەبێ مژین تامێکی زۆر ئاگراوی هەبێ ؟ بۆیە وەک لە فیلمدا چەند جاری بینیومە، پێڵوی چاوی پیاو قورس دەبێ و ئەسـتـۆی حـەزی دەچەمـێنێ و ڕۆحی ئارام . جـێگەی تەنیـا، ژووری تەنیا، بیری تەنیا، هەناسەی تەنیا، تلی تەنیـایی.ئاخ .... ئای تەنیـایی ! دەبێ ئیـمـشـەو ئەو سکرتێـرە قژ زەردە شـۆخـە چۆن بژی؟. کێ ئەو لەشە نەرم ونۆڵەی بە ڕووتی لەباوەش دەگرێ و لەگەڵ قــریوە و ســرپەی وردە مــاچدا، تل بەو ناسکە دەداو تەڕایی لێــوە قاوەییەکانی هەڵدەمژێ؟. ئەی خوای گەورە دەبێ لە ژێر ئەو بلوسە ڕەشەوە چ جوتە مەمکێ خۆیان حەشار دابێ؟ .چ بەختەوەرێک ئەو گۆپکە پەمەییانەی دەمژێ؟.یان کوڕێکی وەک خۆی قۆز و جوان وڕوو ناسک وبێ زیبکەیە، یان بەڕێوەبەرێکی پیــری دەوڵەمــەندە. ئای ژیان.. واچەند ساڵە لەم ولاتەدا دەژیم، نە لەشێکی باریکم لە باوەش

گـرتووه، نه گـۆپکەیەکی پەمـەیمی قـژزەردێکم مـژیوه، نەهەناسـەی سنگی نازدارێک هەناسەمی بۆن خۆشکردوه ٠)
جارێکی تر سەیری لەپی دەستی ڕاستی کرد وهەناسەیەکی هەڵکێشا:
(تاکـەی دەبیـتـه هاوڕێ حـەزەکـانـم؟ ئەی ئەندامی لەشی کـەسـێکی نەگبەت ؟.تەمەن زۆر بەخێرایی دەڕوا و من هەر لە جێگەی خۆم. لە نەگبـەتیـدا چەقـیـوم و هیچ هەنگاوێکم بەرەو پێـشـەوە نەناوە. هیچ گـۆڕانێکم بەسـەردا نەهاتووە ، لە سـپی بوونی مـووەکـانی سـەرم و قوپاویی ڕووم و کزیی چاوم و تەمەنی زۆرم زیاتر. کوا بەختیـاری؟ لە چ کـونجـێکی ئەم ژیانەدا خـۆت ونکردووە؟. بۆ لێم یاخـیت؟ .چ تاوانێکیم کردووه واڕۆژگار سزام دەدا؟. ئەم هەمـوو نەگبەتیه بۆچی!!.
هەژاری، بێکاری ، تەنیـایی، غـوربەت، سـەرەڕای هەمـوو ئەمـانەش، ناشیرینی و ڕوویەکی زیبکاوی ....)
سەیرێکی ئاسمانی کرد و وەک لەتەک خوادا بپەیڤێ:
ـ ئەمانه بۆ.. ئەی خوای گەورە؟ .
ـ بلـێی خـوا هەبێ؟ .ئەگـەر هەبێ و درووسـتکـەری بوون بێ، کـەواته خـوا تاوانبـاره بەرامبـەر بەم هەمـوو نەگـبەتیـانەی مـن؟. نه دەبوو ئەو نەگبەتیانه پێچەوانه بوونایه یان کەمتر؟ . نەدەبوو کەمێک لەجوانی ئەو سکرتێرەت قـارسبکردایه وبتدایه به من ؟،گەر تۆ دادوەری؟. ئەو وا ناسک و نازدار دروست دەکـەیت و منیش به ڕوویەکی زیبکاوی و قەڵبەوە؟. بڕوا بکەم خوا هەبێ؟. گەر هەبێ لەم دەریا خوینە ڕژاوەی مرۆڤ ، چۆن بێدەنگ دەبێ؟! ئەم هەمـوو بێکاری و برسێتییە؟. ئەم هەموو نامرۆڤایەتی و تاوانانە بۆچی؟
هەڵوێستەیەکی کرد و وشکە پەشیمانییەک دایگرت:
واز بێنە.. تۆ دەرەقەتی بێکاری نایەیت.ئافرەتێکت بۆ ڕام نایەت چ جای زۆران گرتن لەگەڵ خوادا! .بڕوات پێیە یان نا، بوونی هەبێ یان نا،چارەسەری کێشـەی بێکاری و زیبکەکانی ڕووت ناکات.. کێشەی تۆ کێشـەی بوون و نەبوونی خوا نیە؟ کـێشـەی بێکاری و تەنیـاییە،

کێشە و نەگبەتی ڕۆح و بێ ئافرەتی و غوربەتە).
زریکەیەک لەمێشکی داو بەری چاوەکانی لێڵ بوون.. لێڵ بوون تا تاریکایی داهات..وەک تەزووی سەهۆڵاوێک خوێنی لەشی بەناو ڕەگەکانیا تێدەپەڕی..هەموو ئەندامانی لەشی کەوتنە لەرزە.. لەناکاو دەنگێکی نامۆ لە کونە گوێکانیەوە خزایە کاسەی سەری و هاژەهاژێک مێشکی گوشی. لە تاواندا هەردووگوێی بەپەنجەکانی دەستی ئاخنی.. تادەهات هاژەهاژەکە توندتردەبوو.. کاس بوو..سەری کەوتە خولانەوە .لە تاواندا بەهەردوولەپی دەستی سەری جەڕاند وسەری بەناو کۆشیا شۆڕکردەوە.. تاسا.. گێژەڵوکەیەکی باریک لە قوڵایی ئاسمانەوە بە تیژی بەرەو زەوی کشا وزۆر بەتووندی بەدەوریا خولایەوە وەک پارچە کاغەزێکی تەنک لەسەر کورسییێکە هەڵی گرت و بەرەو قوڵایی ئاسمان فڕاندی وهەڵیلوشی.. هاواری دەکرد کەس گوێی لەدەنگی نەبوو.. خۆی ڕادەپسکاند و لە باوەشی گێژەڵوکەکەدا خولی دەخواردو بەرەو قوڵایی ئاسمان دەکشا. کشا ..کشا تا لەزەوی دوورکەوتەوە.. لەقوڵایی ئاسماندا چاوەکانی کرانەوە ، هاژەهاژەکەی مێشکی نەما و بەچواردەوری خویدا دەیڕوانی . وەک لەناو فڕۆکەیەکدا بێ، ئۆتۆمۆبێل و شەمەندەفەرو شار وشەقامەکانی و ڕووبار و شاخی دەبینی.. بەرزبۆوە تا دورگەو ئۆقیانوسەکانی بە ڕوونی لەیەک جیادەکردەوە. هەرچی ئەو نەخشانەی لە قوتابخانەو وانەی جوگرافیەدا بینی بوونی لە قوڵایی ئاسمانەوە بینی .( ئەوە نیوە دورگە جزمەییەکەی ئیتالیایە.. ئەوە دورگەی بەریتانیایە.. ئەو هێڵە درێژە دەبێ شورا بەناوبانگەکەی چین بێ.. بەرز بۆوەو بەرزبۆوە تا تۆپی زەوی بەڕەش و سپی بینی.
ئێستا لە ئەمریکا شەوە ، بۆیە نیوەی زەوی ڕەشە و نیوەی سپی.)
تۆپی زەوی لەبەر چاوی بچوکترو بچوکتر دەبۆوە تا وەک خاڵێکی کاڵ لەبەرچاوی وون بوو..فیشکە فیشکی بەردە ئەستێرەکان بەلایدا تێدەپەڕی و زراوی بردبوو. گێژەڵوکەکە خۆی بە قوڵایی گەواڵە

هەورێکی سپیداوکرد وردە وردە خاو بووەوە و لەسەر پشتی کۆمەڵە هەورێک بە ئەسپای فڕێدرا. گێژەڵوکەکەش لە قولآیی هەورەکاندا بەهێمنی توایەوە.
بەترس ودڵە لەرزەوە لەسەر هەورەکە دانیشتبوو. قاچەکانی درێژکردبوو. جوڵەو هەناسەی لە خۆ بڕیبوو. ترس سەرتاپای جەستەی داگیرکردبوو. ها ئێستا ها تۆزێکی تر هەورەکانی ژێری دەترازێن و دەخزتێە خوارەوە و هەپرون بە هەپروون دەبێ.
(ڕەنگە هەر بەئاسمانەوە قەل ودالّ هەنجن هەنجنم بکەن.)
بەئەسپایی وترسەوە ملی بەملاولای خۆیدا جولآند، تاچاوی بڕی کرد ڕوانیە چواردەوری. لە قوولآییەکی سپی بەولاوە هیچی تری نەدەبینی . نە جریوەی باڵندەیەک ، نە هاژەی جۆگە ئاوێک نە فڕەی ئۆتۆمۆبێلێک نە سرپەی پێی ڕێبوارێک ، نە شەماڵێ ، نە گەرماو نە سەرما.. کش و مات ، بێ دەنگی و تەنیایی . تەقەی دانەکانی خوی دەبیست ترس هەناوی لە بەر بڕیبوو . بە ئەسپاییەکی ترساویەوە کەمێک خۆی جولآند و لەپی دەستێکی بەسەر پشتی هەوەرکەدا خشاند و هەستی بە نەرمۆڵەیەکی لۆکەیی کرد. بە پاژنەی پێیەکانی هەوەرەکانی ژێر پێی جولآند.. جارێکی ترسەیری ڕاست و چەپی کرد و هیچی نەدی . بە ترس وبەئەسپاییەوە هەستایە سەرپێ و جێ پێیەکانی تاقیکردەوە. هەنگاوێکی کورتی نا، جارێکی تر بەچواردەوری خۆیدا ڕوانی ، نە هیچی بیست و نەهیچی بینی، تەنیایی و چۆڵی وکش وماتی ناوچەکە هەرەسی بە توان و ووزەی هێنا و ترس و بێ هیوایی دایگرت.. چەند هەنگاوێکی نا:
(لە کوێم؟ نازانم.چاوەکانی ئاوی تێزا ،هەستی بەداماوی و نەگبەتیەکی قورس دەکرد .چۆن گەیشتمە ئێرە؟ نازانم ... چیم بەسەردێ!..نازانم،ئای دایەگیان ئۆف باوکە ڕۆ .
(نووکە نوکی گریان و بێچارەی و ترس وتەنیایی هەرەسی بەتوانای هانی .نوکەکان بوون بە قولپەی گریانێکی بەکوڵ و بەدەنگێکی بەرز

و گڕو نەشاز دەیشیڕان . لەناکاو وەک پیرەمەگروونی سەرتاپا سپی چلەی زستان ، شاخە هەورێکی سپی بڵند بەرامبەری دەرکەوت، لەپشتییەوە، چەپکە تیشکێکی ڕەنگاوڕەنگ دەدرەوشانەوە، بەبینینیان دڵخۆش بوو .

( دەبێ لەو دیو ئەو شاخەوە ئاوەدانیەک هەبێ؟ پێدەچێ شارێکی پڕ گڵۆپ و چراخان و قەڵەباڵغ بێ؟ .

(لە خۆشی شاخی هەور و ڕوناکییەکەی پشتیەوە ،ترسی ڕۆچونی هەورەکانی ژێر پێی لەبیر چووەوە.. بە هەنگاوی خێرای بەسەر هەورەکەدا ، بەرەوە ڕوویان هەنگاوی دەنا، چەند هەنگاو لێیان نزیک بکەوتایەتەوە . ئەوەندە ڕووناکی و شاخە هەورەکە دووردەکەوتنەوە، چەند ئەم خێرا بوایە ئەوەندە شاخە هەورەکەو ڕوناکییەکەی پشتی خیرا دووردەکەوتنەوە.. هەڵوێستەیەکی کرد و ئاوڕێکی لە دواوە دایەوە. سەیرێکی شوێن پێیەکانی خۆی کرد، ئاساواری شوێن پێیەکانی خۆی نەدی، وەک لە دەشتێکی تازە بە بەفرداپۆشراودا بێ وکە هیچ دڕندە و باڵندەیەکی پیادا نەڕۆیشتبێ . ئەو ناوچەیەدا دەبینرا..هەر لە شوێنی خۆیەتی، نە بیابانە لە تینوێتیدا بخنکێ و نە جەنگەڵە لە دڕندەیەک بترسێ..، هەستەکانی وەستابوون . نە تینوی بوو نە برسی ، نە سەرما و نە گەرما.. بێدنگی ناوچەکەو تەنیایی تۆقاندبووی . لە گریان و قیژەو هاوار زیاتر هیچ توانایەکی تری نەبوو. تەنیا دەنگی خۆی نەبێ هیچ دەنگێکی تری نە دەبیست . لە داخاندا دانەویەوەو بە چنگ کەوتە هەڵکەندنی هەورەکانی ژێر پێی.

(مردنم لەم ژیانە باشترە.. با بمرم ، بخزێمە خوارەوە هەپرون بەهەپرون ببم. )

چەند هەوری هەڵدەکەند، ئەوەندە هەور دەچووە شوێنی . لەمەش وەڕز بوو.. بە چیچکانەوە دانیشت و سەری خستە نیوان ڕانەکانی و بەکوڵ گریا.

(ئاخ خوایەگیان ، ئەم نەگبەتیە چیە وا داماوی کردووم.. کەسێک نیە دڵی بەمن بسوتێ.
کڕوزایەوە ، تا لەگریان و هەنسکی خۆی بێزار بوو. لەناکاو دەنگێکی ناسکی ڕۆح ئاسوودەکەرو پشودەر ، بەشێوەی شەپۆلی ڕەنگاوڕەنگی جوان ، لە پشت شاخە هەورەکەوە پەخش دەبوو.
ـ تۆ تەنیا نیت !
ڕاچڵەکی و سەری لەناو کۆشیدا دەرهێناو واقی وڕما. چاوەکانی زەق بوون، دەمی بە سەرسامیەوە کردەوە و بەوریاییەوە گوێ قولاغی دەنگەکە بوو. دەنگێکی ئارام و ناسک کە لەژیانیدا دەنگی واخۆش و پڕ نۆتەی نەبیستبوو. لەیەکەم ساتی بیستنیەوە عاشقی بوو.
(ئەم دەنگە چەند خۆشە نە دەنگی پیاوە نە هی ئافرەت؟!
هاواری کرد و بەپرتاو هەستایە سەرپێ :
( تۆ کێیت..؟ لەکوێیت ...؟ چاوت لە منە؟ بە قوربانت بم فریام کەوە وا خەریکە بەتەنیا شێت دەبم، من لە کوێم؟
وەڵامی پرسیارەکانی نەدرایەوە و بێدەنگی ناوچەکەی خنکاندبوو ، ئەمیش لەچاوەڕی وەڵامێکی دڵخۆش دابوو، پاش کەمێک دەنگەکە ووتی:
ـ من خوام.. لە هەموو شوێنێکم..لێرەم لەسەرزەوی ، لە ئاسمان لە هەموو کون وقوژبنێکی ئەم بوونەدام.
بە بیستنی وشەی خوا هەموو جەستەی هاتە لەرزین و ترسێ هەناوی هەڵتەکان و ناودەمی وشک هەڵگەڕا. سەیرێکی لەش ولاری خۆی کرد و دەستێکی بەخوێدا هێنا.
(من مردووم، ئەمە ڕۆژی قیامەتە و بەرامبەر خوا وەستاوم؟ .کەی مردم..؟ چۆن مردم؟ .
دەستی بۆ دڵی برد:
(ها دڵم لێدەدا....لێدانێکی زۆر خێراش! ) .
وەڵامێ لە ڕوناکیەکەوە بەرزبۆوە:

ـ تۆ نەمردویت.. کاتت ماوە!
خوێن پەڕییە ڕووی و سوور هەڵگەڕا
(خۆ من هیچم نەگوت، پرسیارێک بوو و لەدڵی خۆمدا کردم ! .
جارێکی تر شەپۆلی ڕووناکیەکە پەخشبوو وتی:
ـ منی خـوا ئاگـام لەهەمـوو هەست ونەست و هەڵس وکـەوت و بیرکردنەوەیەکی ئێوەی مرۆڤە.
لەترساندا ناودەمی ووشک هەڵگەڕابوو، لەجێگەی خۆی مۆلەق بوو، ملی لەنێو لەشیا شاردبۆوە. بە ڕێز و ترسەوە بۆ پێشەوە نوشتابۆوە وەک شەقشەقە دەلەرزی.
ـ ئەی خوای گەورەو میهرەبان چیت لەمنی کەساس گەرەکەو بۆمنت هێناوە بۆ ئێرە؟ .
ـ زۆر دەمێکە دەکوڕوزێیتەوە.. زۆردەمێکە لە ژوورە تەنیاییەکەتدا دەچەوسێیتەوە.. زۆر دەمێکە بەسەر وێنەکانی دایکتدا دەگریت و یادگارەکانی کوردستان دەتسوتێنێ و تاسەی هاوڕێکانت دەکەیت.
ـ لە ژوورەکەشمدا ئاگات لێمە چی دەکەم و چی دەخۆم؟ .
ـ من کە لە هەمـوو شـوێنێکی ئەم بوونەدا بم دەبێ ئاگـام لەهەمـوو مرۆڤ و زیندەوەرەکانی سەر زەوی بێ!
تەریق بووەوە، ئارەقێکی تەنک لەشی داگرت، سەیری لەپی دەستی ڕاستی کرد و لەشەرماندا خستیە پشتیەوە.
ـ دەستەکانت مەشارەوە، شەرم مەکە، ئەو نەگبەتییەی ئافرەت یان پیاو ناچاردەکات بۆ ئارامکردنەوەی گڕی ئارەزووەکانی پەنا بۆ بەری دەست و دڵی پەنجەکانی بەرێ ئەوە زوڵمی کۆمەڵی لێکراوە.
ـ خوای گەورەو مهرەبان بۆچی منت هێناوە بۆئێرە؟ .
ـ زۆر دەمێکە بۆ دایکت دەگریت؟ .
ـ ڕاستـە گەورەم، هاتنی من بۆ ئێرە چ پەیوەندی بە خۆشەویستی دایکمەوە هەیە؟ یادی بەخێر زەمانێکە مردووە! دەستی شکاوم، شەرمەزارم بەرامبەر بەمیهرەبانیەکەی!

ـ بەمەبەستی دیداری دایکت تۆ گەیشتوویتە ئێرە!
شاگەشە بوو بە هەر چواردەوری خۆیدا سەمای دەکرد.
ـ یانی دەتوانم دایکم دوای ئەم هەمکە ساڵە جارێکیتر ببیینمەوە؟
ـ بەڵێ..
بەرەو ڕوناکیەکە هەنگاوی ناو لەخۆشیاندا دەتریقایەوە هەڵدەپەڕی و هاواری دەکرد.
بەچواردەوری خۆیدا دەخولایەوە و هەڵدەبەزیەوە
( دایە گیان لە کوێیت؟ دایە لەگەڵ خوادا قسە دەکەم .
( خوا دەنگی هەیە ورەنگی نیە دەبێ خوا چۆن بێ؟ جوان بێ وەک ئەو سکرتێرە قژ زەردە یان جوانتر؟ .بێگومان ئەو بتوانێ ئەو سکرتێرە جوانە دروست بکات دەبێ خۆی چۆن بێ؟ خۆزگە دەمبینی !
ـ ئەی خوای گەورە تو گەورەیی خۆت با بۆ ساتێک بۆ چرکەیەک با بتبینم لە کوێیت؟ هەرباست دەکەن ، کەس نازانی ڕەنگ وقەبارەو وێنەت چۆنە ، ڕێگەم بدە بامن یەکەم مرۆڤ بم بتبینم ! .
ـ تۆ ناتوانی من ببینی ! لەهەموو شوێنێکم، من ڕوناکیم. تیشکم ، تیشکێ هیچ زیندەوەرێ ناتوانی لێم نزیک بکەوێتەوە.
ـ ڕووناکی؟ تیشک ؟ بۆیە لەشەودا ئەو هەموو تاوان ودزی و کوشتن و زوڵم و زۆرە دەکرێ؟ .
ـ شەوو ڕۆژ بۆمن وەک یەکە! .
پرسیارێکی دووسەر لە دەروونیا وەک قارچک هەڵتۆقی!
ـ بیکەم یان نا؟
لە تەتەڵەکردن ورێکخستنی پرسیارەکاندا بوو.
ـ ئەگەر ڕووناکیت و لە شەویشدا دەردەکەوی ، چۆن ، شەو تاریکی نارەوێتەوە؟ .
ـ من تەنیا سەرەتاترین نهێنیەکانی خۆمم ئاشکرا کردووە ئێوەی مرۆڤ یەکتری دەخۆن.درۆدەکەن تاوان دەکەن ،بەناوی منەوە شەڕدەکەن

ـ قوربان خەجاڵەتم، تۆبە ،لێم ببورە پرسیارێکی نابەجێ بوو، دەزانم تەنیا پێغەمبەرەکانی خۆشەویستی بەڕێزتان نهێنیەکان دەزانن، خۆ من پێغەمبەر نیم دەرگای نهێنیەکانتم بۆ بخەیتە سەر پشت تۆبە خوایە بمبەخشە ، تۆبە.
ـ پێغەمبەرەکانیش هەموو نهێنیەکان نازانن ئەوانیش هەریەکە لە کات وشوێنی خویدا وەک هەموو مرۆڤەکانی تری سەر زەوی دەسەڵاتی دنیایان بۆ مەبەست و بەرژەوەندی و ئارەزووەکانی خۆیان و خاوو خێزان وخێڵ ونەتەوە بەکارهێناوە.. ئەوانیش وەک هەموو مرۆڤەکانی تر لەڕۆژی دروست بوونیانەوە تا مردنیان لەژێر تاقیکردنەوەی مندابوون، لە زۆر ویستەکانی من لایان داوە، بۆیە هەموو تواناو نهێنیەکانی خۆمم لا نەدرکاندوون .
تا خوا زیاتر بدوایە ئەم پرسیاری زیاتری لا دروست دەبوو. پرسیارەکان ناومێشکی جەڕاندبوو، ئەوپرسیارانەی لەو ڕۆژەوەی ئیسلامی لەدایکە نەخوێندەوارەکەیەوە وەرگرتبوو لای کەڵەکەببوون.ئەم عاشقی پرسیار بوو، ئەو پرسیارە نهێنیانەی دینەکان ڕیش پان ومەلاکان تابۆ و بفەیانکردوە .
ـ دەیکەم فرسەتەو خوای مەزن بەمنی کەساسی بەخشیوە، کەس گوێی لێنیە، نە کۆلکە مەلاکان نە ئیسلامە سیاسیەکان،، بۆ نەیکەم؟ نەکەس تووڕە دەبێ نەخوای گەورەش زویر دەبێ. خوا وەک ئەو کۆلکە مەلایانە نیە. میهرەبانە، ئا دەبێ بیکەم ئەوپرسیارانەی زمانمانی لاڵ کردووە، هەنگاوەکانمانی ئیفلیج کردووە. دەبێ نهێنی و جیاوازی لەنێوان خواو پێغەمبەران وئایین دا هەبێ، بۆ نا؟ خوا ئەوەندە میهرەبان بێ ئەو شانسەی بەمن بەخشیبێت و منی گەیاندبێتە ئێرە بۆ نەیکەم؟ دەیکەم.. بڕواناکەم زویر ببێ؟ ئا دەیکەم و هەموو سزایەکی خواش لەسەر سەرم، چونکە دەزانم خوا لەسەر ڕاستیەو ڕاستی خۆش دەوێت ئا بۆ نا ؟
کام پرسیار لە پێشەوە بکەم ؟

ـ ئەی خوای گەورە ومیهرەبانم ، کام پێغەمبەر خوشەویستی تۆی بەرێزە و بەئارەزوو ویستی میهرەبانی تۆی گەورە هەڵسوڕاوە ؟ عیسا ، محمد ، موسا ، زەردەشت ، نوح ، ئادەم ، ئیبراهیم ؟؟؟
ـ نوح ڕزگارکەری مرۆڤ و زیندەوەران بووە، خۆشەویستمە. زەردەشت عاشقی ڕاستی یە و تائێستاش لە پانتایی بەهەشتدا بەدوای حەقیقەتە وونبوەکانی بووندا دەگەڕێ ! ئەم مرۆڤە زرنگ و یاخیەم زۆر خۆش دەوێ .
ـ ئەی ئەوانی تر ؟
ـ ئیبراهیم (صفا ازر) لەو ڕۆژەوەی چاوی هێزی بینین و مێشکی توانای بیرکردنەوە و زمانی دووانی پەیداکرد ، عاشقی جوانی سروشتی هەورامان و نیشتمانەکەی بوو، هەمیشە ئەو پرسیارەی لە خۆ دەکرد، کێ دروستکەری ئەم هەموو جوانیەیە ؟ چۆن پارچە دارێکی تاشراو، بەردێکی هەڵکەنراو، دەبێ خوای ئەم هەموو شتە جوانانەبێ ؟ هێشتا لەهەرەتی جوانیدابوو ، یەکەم سەرەتای شۆرشی لەخۆی و ژوورەکەی و خیزانەکەیەوە دەستی پێکرد.
لەشەوێکی زستانی سەختی هەوراماندا ، لەبەرچاوی دایک و بابی و خزم و کەس و کاری بتی ژوورەکەی خۆی شکاند و خستیە زۆپای ناوەڕاستی ژوورەکەیانەوە .
فەرموو دایە فەرموو بابۆ، ئەوە خوای خۆم سوتان ! بزانن چیم لێ دەکات ، ئەم بتانە خوانین خوا سروشتە !تا تەمەنی زیاتر بوایە پرسیارەکانی زیاتر لای کەڵەکە دەبوون ، بالآ کەڵەگەت ، ناوشان پان، موو ڕەش، چاوقاوەیی بازوو ئەستور ، دڵفراوان، بوو بە فریشتەی ناوچەی هەورامان .هەر کەسێک پێویستی بەکۆمەک بوایە یارمەتی دەدا ، هەر کەسێک نەخۆش بوویا دڵنەوایی دەکرد، قسەکانی ، ئامۆژگاریەکانی بۆنی ، خوشەویستی مرۆڤی لێ دەهات .
لەکاتی بێکاریدا دەچوە بن دارگوێزێکی باوەش پان و چارۆکەیەک نان و چەند دەنکە هەنجیرێکی شیرینی دەبردو بیری لەبوونی هێزی

هەڵسورێنەری ئەم بوونە، شیرینی ئەو دەنکە هەنجیرانە دەکردەوە، بیری دەکردەوە دەیویست نەتەوەکەی لەنەگبەتی و گەوجی ڕزگار بکات ، چۆن پارچە دارێکی داتاشراو بەردێکی نەخشێنراو دەبێ بەخوا ؟ (ئەو بتانە چۆن دەتوانن ، ئەم نیشتمانە جوان و ئەم ئافرەتە شۆخانە لە هەورامان و دنیادا دروست بکەن ؟ ) .

ئەی دەبێ کێ بێت ... سروشتە..خوایە..خوا ، خواکانی ئێرە؟ نا بێگومان نا ،ئێمە خۆمان خواکانمان دروست دەکەین لەبەرد ودار دەیان تاشین ، کەواتە ئێمە خوای خواکانمانین نەک ئەوان ، نەخێر ئەوانە بتن و بەری بیری دواکەوتووی باو باپیرانمانن ، دەبێ ئەم سیستەمە بڕوخێ دەبێ ئەم هەمــوو بتــانە بشکێ ، دەبێ ئەم دەڤــەرە بگۆڕێ ، دەبێ ئەم خەڵکە هەژارە هوشیــار ببێــتەوە. ئەی کێ ببێ بەخوا... مرۆڤ بێ خوا ئۆقرە ناگرێ. ئا خوای مرۆڤ ڕاستییە ( حەقیقەتە ) بۆچی نا ؟ کەواتە خوا سروشتە .. ؟ نا سروشت خوایە.. چ جیاوازی و پەیوەندیەک لەنێــوان ئەم دووانەدا هەیە ؟ . ســروشت ،ئا دەیبــینم شاخ ، دەشت ، ئاوی سازگار، میوەی بەتام، ئافرەتی شۆخ ، پیاوی بەتوانا ، زیندەوەران باڵندەکان گۆڕانی وەرزەکان ، هەنجیری شیرین ، گوێزی چەور ، ئەمانە گشتی بەری سروشتن کەواتە سروشت خوایە ؟ ئاخ بۆچی ئەم پرسیارانە یەخەم بەرنادەن ؟ بۆچی وەکی باوک ودایکم و کەسانی تری خێڵەکەم بیر ناکەمەوە ؟ ئەمەشیان دڵخۆشیە و دیاری سروشتە و بەرمن کەوتوە ، من وا دروست بووم پرسیار بکەم سەیری چواردەوری خــۆم وبکەم چاوم نەنوقــێنم ، درۆنەکــەم ، بەهوی بێ هەڵوێستی و ناهوشیاری باپیرانمانەوە ، نەوە دوای نەوە درۆکان لە ڕۆحماندا کەڵەکەبووە، دەبێ یەکێک هەبێ ئەو قەڵای درۆ وبیرە بۆشە بڕمێنێ ؟ من دەیکەم ، دەبم بەیەکەم کەس چۆن بتی ژوورەکەی خۆمم سوتاند دەبێ بتی ئەو پەرستگایانەش بڕمێنم . وەلی ئەمەیان بەتەنیا ناکرێ ، دایک وبابم بێدەنگ بوون . کوردی ناهوشیار بێدەنگ نابن چەند ساڵە پیرۆزی ئەوبتانە لە ڕۆحیاندا مەڵاس بووە ، ئەمە بیانوە

دەبێ نەمـێنێ ڕۆژێـک زوتر ئەوبتـانە نەمـێنێ کـورد ڕۆژی زوتـر خـوی دەدۆزێتـەوە کورد وون بوون، لـەنیشـتـمان و ناو هۆزو کـەس و کـاریاندا نامۆن چونکە ڕاستی نازانن وونن چونکە ئەوخوایانە گەمژەیانکردوون بۆیە دەبێ بۆ دۆزینەوەی خود میللەتی کورد ئەوبتانە بڕمێنرێ ، مرۆڤ تاخوی نەدۆزێتەوە بەختیارنابێ یانی ئازاد نابێ ئاواش ئەم میللەتە تا لەتاریکستانی وونبوون ڕزگاری نەبێ ئازاد نابێ دەزانم کارێکی بڤەیە سـەخـتـە ڕەنگە ژیانمی لەسـەردانێم وەلی هەر دەیکەم دەبێ ژیـانم بەرهەمـێکی هەبێ بۆ مـیللەتەکەم بۆگشت مرۆڤـایەتی ، چەند خـۆشە بتوانم لە هەورامانەوە تیشکی ڕاستـی بۆ گشت جیـهان پەخشبکەم ،دەبێ ببم بەرابەری ئەو ڕاستیەی کە ئەو بتانە لێیان شاردوینەتەوە٠

ڕۆژ بەڕۆژ چاوی گەشتر دەبوو ، توانای زیاتر دەبوو ، ئەو بێدەنگ بوو وەلێ لەناخیا هەزارەها پرسیار دەکولا٠

لە هەرەوەرزی درونەوەی پەڵە گـەنمـێکی دێدا ، لەتەک شـۆخـە کیژێکیدا شان بەشانی یەک پشتیـان چەمابوو، پەڵەگەنمێکیان لەبەر خـویانەو گـیـردابوو..بەدەم هۆرە و گـۆرانیـەوە و بەدەم بزە وحـەزی هەرزەکـاریەوە نیگایان دەگـۆڕیەوە ، چوار چاوی گـەشی پڕ پاکی پڕ جوانی پڕ عـەشق پڕ ئازایەتی پڕ هەموو هەستـە پیرۆزەکـانی دەروونی مـرۆڤـایەتی بەیەک گـەیشـتن ، بەزارا ئاشنا بـوو ، هەر ئەو ڕۆژە چاوەکانیان نامەی دڵی هەردووکیانی بەیەک گەیاند، ڕۆژ و مانگەکان تێپـەڕی، لە دڵداری چاو و بزەی لێـوەوە ترازان بۆ ژووانێ . ڕۆژێکی هاوین بـوو تیشـکی خـۆر ماچی گـۆنای سروشـتی جوانی هەورامـانی دەکـرد، لەبن دارگـوێزێکی سـەر کـانیـەکی سازگـاری دووره دێ لەگـەڵ زارادا یەکەم ژوانیان کـرد ، پێڵاوەکانیان داکەن و قـاچەکانیان لە ئاوی کـانیـەکە خست ، زارا کـەمـێک پزووی دەرپێکەی هەڵخست وقـاچی خرپن و پاژنەی خڕ و سـەرەتای پوزێکی ناسکی بۆ صـفـا دەرخست ، چاوی حـەزی صفـا بە لەشی ڕووتی ژێر بەرگـەکـانی زارا دا هەڵزنی و پارچە مـانگێکی لەشی بینی و هەر لەوێدا حـەزیان بـوو بەچەپکە

مـاچێكی گـەرم، بە باوەشی یەكـتـری ئاشنا بوون و بوون بە دێوانەی یەكتری .
هێشتا تامی ماچاكانیان نەچوو بووە قولایی ڕۆحیانەوە صفا زارای لەباوەشیا دانابوو وورد وورد دەستی مهرەبانی و خۆشەویستی بەسەرو قژیدا دەهێنا پرسیاری لێكرد:
ـ زارای جـــــوان.. تۆ دەزانـی كـێ تـۆی بـەم نـاسـک ونازداریـەوە دروستكردووە ؟
ـ ئەرێ بۆ نا صفا گیان ، لەخوا زیاتر كێ ی تر هەیە ؟
ـ چ خوایەک نازدارەكەم ؟
ـ خواكانمان ... ئەوخوایانەی هەمیشە دایكم لێیان دەپارێتەوە و نوێژ و قوربانیان بۆ دەكات !
ـ نا ، شیرینەكەم ، ئەو پارچە تەختە و دار و بەردە داتاشراوانە چۆن دەتوانن تۆ بەم ناسک و نازداریەو هەورامـان بەم جـوانیـە دروست بكەن.
ـ ئەی كێیە ؟
ـ من دەڵێم سروشـتـە یانی خوایە.. خـوایەک جیـاواز لە خـواكـانی ئێـمـە.. ئەم سروشـتـەیە بەرنامـە گـێـڕی وەرزەكـانە من دەمـێكە بتی ژووری نوستنەكەم توڕداوە... سوتاندم ، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ بەختـیـاریم زیاددەكـات ، هەست بەبوونی خۆم وهێـزێک دەكـەم هێـزێک منی لەو بتـانە گـەورەتركـرد ،پیـرۆزتركـرد ، من خـراپە ناكـەم ، درۆنـاكـەم ، یارمەتی خەڵكی داماو و هەژاردەدەم ، خۆشەویستی دەكەم وەک خۆم گەرەكمبێ وادەكەم ، كەواتە من خوام هەیە خواكەشم هەڵسورێنەری ئەم كـار و بیـر و ڕەوشـتـەی ، منە یانی ویژدانم ، كـەواتە خـوای من ویژدانمە .
ـ ئەری واللە صفا گیـان ، تۆ باشترین و پاكترین گەنجی ئەم ناوەی بۆیە لەیەكەم ساتەوە شەیدات بووم.
ـ زارای جوانم، خۆشەویستی بەشێكە لە حەقیقەتە سروشتیەكان ،

خۆشەویستی یانی بوونی هەستی مرۆڤایەتی مرۆڤێ مرۆڤێکی تری خۆشدەوی ماچیدەکا لەباوەشی دەگری ،نەخۆش بوو بۆی دگری ئەمانە مرۆڤایەتین ،مرۆڤایەتیش یانی حەقیقەت ، ڕاستگۆیی ، هەستی جوان ،ویژدانی پاک ، ئا ئەمانە گشتی حەقیقەتی مرۆڤن ، بۆیە هەموو کەسێک خوایەکی لەتەکدایە کە هەڵسورێنەرو ڕێکخەری کردارەکانی مرۆڤە یانی ویژدان . ویژدان خوای مرۆڤە، کەواتە زۆر خوا هەیە مرۆڤ بڕوای پیبکات وڕێزی لێبگرێت زیاتر لەو بتانەی خۆمان دامان تاشیون خوای سروشت خوای ویژدان .

پرسیار و وەڵامەکانی صفا هێندە ژیرانەبوو، هەر لەیەکەم ساتەوە زارا بڕوای پێکرد ، بوو بە قوتابی بیری نوێ .

ـ تۆ ڕاست دەکەیت ، هەر ئیمشەو منیش خوای ژووری نوستنەکەم تورِ دەدەم دەگەڕێم بەدوای ئەوڕاستیەدا کە تۆ بە دوایدا وێڵیت ، ئیتر ناچم بۆ پەرستگا و .. من و تۆ دەبینە خوای یەکتر و سروشت خوایە ، خۆشەویستی خوایە .

ـ ئا زارای شیرینم ، ئێمە بوین بە دوو خۆشەیست دەتوانین بەیەک بگەین و زەماوەند بکەین . ببین بە خاوەنی ماڵ و منداڵ و زۆر ویستی خۆمان . وەلێ ئەمە بەس نیە، هەموو ژیان نیە، ژیان دەبێ بەرهەمی زیاتری هەبێ نەک تەنیا بۆخۆمان بۆ گشت مرۆڤایەتی، بۆ ئەو کۆمەڵ و کەسانەی تا ئێستا پەیان بەڕاستییەکانی ژیان و سروشت نەبردووە، ئێمەی مرۆڤی کوردیش ، بەشێکین لە کۆمەڵگای دوا کەوتووی ئەم جیهانە ، دەبێ سەرەتا لێرەوە ، لەخۆمانەوە دەست بەشۆڕشێک بکەین، شۆڕشێک بەختیاری و سەرفرازی و ڕاستی بۆ گشت مرۆڤایەتی بهێنێ ، شۆڕشێک ئەو ڕاستێیە ئاشکرا بکات پارچە دارێکی داتاشراو و بەردێکی نەخشێنراو چارەسەری گرفتەکانی مرۆڤ ناکات ، بڕوانە چۆن دەستە دەستە خەڵکی هەورامان دەچن بۆ پەرستگا و ڕوودەکەنە پارچە دارێک، بەردێکی داتاشراو، دەبێ ئێمە ئەم کۆمەڵگایە هەڵوەشێنینەوەو سەر لەنوێ لەسەر ڕاستی برایەتی و

خۆشەویستی و یاسایەکی مرۆڤایەتی دایڕێژینەوە . شۆرشێک بکەین ، شۆرشێک مرۆڤ بەرەو ئازادی و ڕاستیە شاراوەکان بەرێ٠
صفا زۆر لەوە ئازاتر و هۆشیارتر بوو حەقیقەتەکان و ویستەکانی ڕۆحی مرۆڤ بشارێتەوە، دڵداری و خۆشەویستیش بەشێکە لەو ڕاستیانەی مرۆڤ دەبێ بەئازادی بیکات ، بۆیە لای شورەیی نەبوو دانیشتوانی بیارە بەم عەشقەیان بزانێ . هەرزوو دڵداری و ماچ و باوەشی خۆی و زارای بۆ دایک و بابی گێڕایەوە ، زەماوەندیان کرد، یەکەم کاریان یەکەم سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕشیان ، لەڕۆژی زەماوەنەکەیانەوە دەست پێکرد ٠
صفا دەستێ ڕانکو چۆغەی شینکی لەبەردابوو ، جووتێ کڵاشی دۆمی تازە چرناوی لەپێدابوو ، چەفتەیەکی گوڵداری لاری بەسەرەوە بەستبوو چەپکێ ریحانەی لەبەر پشتێنەکەی دابوو . زارا واڵا پۆشێکی شەهوەتاوی شۆخە بووکێکی چاوەڕوانی شەوی پەردە وباوەش وحەز و جوانی، چاوەکانی بەسووتوی بایەمێکی چەور ڕەشکردبوو . دەهۆڵ وزوڕنا لەدەوری ماڵ زرمەی دەهات . چەند سەرمەڕ ئامادەی قوربانی بوو ،کەس وکاری بوک وزاوا و هاوڕی و دەرو دراوسێکانیان دەم بەپێکەنین و جوانپۆش دەوریاندابوون ئامادەبوون بەکۆمەڵ بچن بۆ پەرستگای بتەکان و لەوی زەماوەندیان پیرۆز بکەن. صفا بەسۆزەوە زارای لەژێر باڵەکانیا لەباوەشگرتبوو ، لەساتەوەختی چاوەڕوانی بڕیاردابوون ، سەری زارای ماچکردوو ، وەکی بەڵیاندابێ بەیەک کەلەیەکم ڕۆژی زەماوەندیاندا شۆڕشەکەیان ئاشکرابکەن هەردووکیان ڕویان لەکەس وکاریانکردوو بەیەک دەنگ ، بەیەک هەست ، بەیەک بڕوا وهێز ووتیان :
ـ نا ئێمە ناچین بۆ پەرستگا، پیرۆزیی شایی و زەماوەندی خۆمان لە پارچە تەختە و دار وبەردێکی داتاشراو ناکەین . ئەوانە خوای ئێمە نین و ژیانمان پیرۆز ناکەن . ژیانی ئێمە ڕاستی وخۆشەویستی پیرۆزی دەکات . خوای ڕاستی ، خوای خۆشەویستی ، ڕووناکی

خوای دروستکەری هەموو ئەم شتە جوانانەی سروشت ، لەجیاتی ئەوەی بچین بۆ لای بتەکانتان ، دەچین بۆ پەرستگای جوانی سروشت و سەر ئەوکانیەی یەکەم ژووان و یەکەم ماچمان لێکردوە .
ئەمە سەرەتایەکی بڵاوی ئاشکراکردنی بیری شۆڕشەکەیان بوو. صفا بوو بە ڕابەروکەسانێکی زۆر بڕوایان پێکرد .
بەیانیەکی زوو شانبەشانی هاوژین و هاوبیری زارا و هاوبیرەکانی تریەوە، ڕاپەڕین و هێرشیان کردە سەر پەرستگای بتەکان و گشتیان شکاند. وەلێ دوای چەند ڕۆژێک تورەبوونی کورد تەقییەوە، ئەم شۆڕشە مەزنەی بۆ هەزم نەکراو و دەستە دەستە لە دەوروپشتی دێهاتەکانی هەورامانەوە دەهاتن صفا هاوبیرەکانیان دەستگیر کرد بڕیاری سوتاندن و کوشتنیان دا ، بابی زارا کەوتە فریای نەیان سوتاند و شاربەدەریان کرد. سەرو سمێڵ و برۆ و برژانگیان تاشی و سوار کەرێکی کلک بڕاویانکرد و لە بەهەشتی هەورامان دەریان نا.
لەدوا دەربەندی شاخێکدا هەڵۆێستەیەکی کردو ئاورێکی لە بیارە دایەوە، چاوەکانی بۆ نیشتمان و بۆ نەتەوەکەی پڕ بوون لەئاو ٠
( ئاخ ئەی نەتەوەی کورد ، هەتاماون دەبێ وا بەگەوجی بژین، من گەرەکم بوو بتانکەم بە بەختیارترین کۆمەڵی ئەم سەر زەویە. من ویستم ڕاستیەکانتان بۆ ئاشکرابکەم . من ویستم ئاشتی ، برایەتی ، بەختیاریتان بۆ مسۆگەر بکەم، ویستم لەو خەیاڵ و خەو و درۆیانەی باو باپیرانمان بۆیان بەجێهێشتوین ڕزگارتانکەم . هەتا وابن بەختیار نابن، تا ئێوە بت پەرست بن ، بێبیر بن ، بێهەڵوێست بن ژیانتان دۆزەخ دەبێ . من دەڕۆم ، لە هەرشوێنێک بۆم هەڵکەوێ شۆرشی ڕاست دەکەم ، خەڵکی لە نەفامی و برسێتی و ئاژاوەو نایەکسانی و خراپەو بتپەرستی ڕزگار دەکەم، من خاوەنی حەقیقەتێکم سروشت سەرچاوەکەیەتی ، ئەو حەقیقەتەی دەبێ هەموو کەس بیزانێ . من ڕۆیشتم ، شار بەدەرتان کردم، وەلێ تاوانتان بەرامبەر ڕاستیەک کرد کە بۆ ئێوەی گەوج لە نان وئاو لە هەوا بەکەڵکتر بوو٠ )

شەو وڕۆژ بێوچان دەڕۆیشتن تاگەیشتنە دەڤەرێکی تر . وڵاتێکی بێ هەنجیر و گوێزو میوەی ناسکی هەورامی . هەر لەویدا دێیەکیان لە پوش وپەڵاش و دارو بەردی سروشتی ئەو ناوە بۆخۆیان دروستکرد . خێڵەکانی ئەو ناوچەیە لەسەر ئاو ،ماڵ ، زەوی ، ژن ، دزی، کوشتن ، خەرمان سوتاندن، لەناو خۆیاندا لەشەڕو پێکدادان و بێ ئارامیدا دەژیان کۆیکردنەوەو قسەی بۆ کردن، قوتابخانەی فیربوونی ڕاستی و ڕەوشتی چاکە و مرۆڤدۆستی بۆ کردنەوە، خیلەکانی دوژمنی بەگژاچووی، فێرکرد چۆن بە ئاشتی و ئارامی بژین، بوون بە برا، بوون بەهاوسێ و هاودەرەو و هاوکاری یەکتری، شایی و زەماوەندو بەختیاری و ئاسودەیی بوو بە هاوڕێی چرکەکانی ژیانیان، دادگا و یاسای بۆ دانان، یاسای برایەتی ( یاسای هەمووڕابین ، حاموڕابی ) و دادوەری بۆ ڕێکخستن، بوون بەکۆمەڵە مرۆڤێکی بەسوود بەکۆمەڵێکی بەهێزو ئاسودە ، دوای چەند مانگێ کۆیکردنەوە٠

لەسەرگردۆلکەیەکی پشت کۆماوە وەستابوو ، زارای هاو خەبات و هاوهەناسەی لە تەنیشتەوە بوو . وەک خاوەن دەستکەوتێکی مەزن بریقەی سەرکەوتن و دڵخۆشی چاوەکانی جوانتر کردبوو، قژە خورماییە کەمێک کاڵەکەی بەسەرشان و ملیا پەخشکردبوو . چاوەکانی لەڕۆژانی پێشوتر زیاتر ڕەشکردبوو، دەستێکی بەدەستی صفای مێردیەوە بوو، دەستکەی تریشی بەدەستی یەکێ لەپیاوانی هاوبڕوا و هاو سەفەر و هاوخەباتیانەوە. ئەویش دەستی بەدەستی یەکێکی ترەوە تا دەگەیشتە ناو خەڵکەکە دەستەکان یەکیان گرتبوو، ئەمە نیشانەی یەکێتی وبرایەتی بوو٠

ـ خەڵکینە سلاوی ڕاستی و برایەتی و بەیانیتان ڕووناک و باش بێ ، ئێستا کام ژیان خۆشە ؟ ژیانی شەڕوشۆڕ و براو خوشک کوشتن ؟ یان ئاشتی و برایەتی و پێکەوەکارکردن ؟ ئەم ژیانە خۆشە یان دزی ومندالّ و ژن و مرۆڤ برسیکردن و پارەکۆکردنەوە و مولک زەوتکردن؟ یان برایەتی ... چەند خۆشە ئەو ووشەیە بەهاوسێکەت

بلێ برامی؟
هەموو دەستیان بەرزکردەوە و هاورایان کرد:
ـ برایەتی ..برامی ، برامی برایمی .. بەڵێ برایمی
ئیتر لەوکاتەوە ناوی صفا گۆڕا بە برایم وکۆمەڵەکەشی، برایمی.
خانەکانی لەشی برایم زۆر لەوە چالاکتربوون ئارام لەشوێنکدا بگرێ، بەرزگارکردنی ناوچەیەک تێر لەویستەکانی بخوا، شۆرش و ووتنی حەقیقەت بورکانێک بوو لەدەروونی برایمدا قوڵپی دەدا . دوای ئەم سەرکەوتنە مەزنەبە ماوەیەک لەگەڵ زارا دا لە ناو کوخەکەیاندا دانیشتبوون و زارا سەرو قژی لەسەر ڕانی برایم ڕاخستبوو برایمیش وورده وورده بێخی سەری زارای ختوکەدەداو بەسۆزەوە بە پەنجەکانی قژی شانەدەکرد .
ـ زارای شیرین قافڵەچیەکان دەگێڕنەوە: لە وولاتێکی دوور و گەرم و بێ ئاو و بێنان و بێ سەوزایی و بێشاخ ووشک و بڕدا گەلێک دەژین ژیانیان ، لە دۆزەخی شەڕوشۆڕ و دزی و مرۆڤ کوشتن و جەردەیی و کاروان تالانکردن وزیندە بەچاڵکردن وفروشتن و گۆڕینەوەی ئافرەت و کۆیلە بە هوشترلە بازاڕێکدا کە پێیدەڵێن (عکاظ ) و بە کورتێکەی ژیانیان لە ئاژاوە وشەڕوشۆڕ وبێ ئارامیدا قەتیس ماوە گەرکمە بچم بۆ ئەگرانە و ئەو گەلە لەو نەگبەتیە ڕزگاربکەم وئاسودەیی و برایەتی ومرۆڤایەتیان فیر بکەم..
زارا سەری لەسەرڕانی برایم بەرزکردەوە.
ـ هەی هاوسەرە شیرینەکەم ...هەی ڕابەرە مرۆڤدۆستەکە هەنگاوەکانم لەتەک هەنگاوەکنتایە ، لەو ڕۆژەوەی بۆ یەکەمجارنێگاکانمان لە ناو حەزی یەکتریدا توایەوە، هەناسەمان تێکەلاو بوو ،ژیانم تێکەلاوی ژیانتە ، غەم مەخۆ ، هەنگاوەکانم گریدراوی هەنگاوتە ، لەگەرمی وساردی و نەبوونی و خۆشی وناخۆشیدا هاوبەشتم.. دەتوانین هەر لەبەیانیەوە کاروانی سەفەر ئامادەکەین ،دەڕۆین ، دەڕۆین لەهەر شۆێنێک چەوسانەوە ،برسێتی ، نایەکسانی ، ئافرەت زەلیل بوون

هەبوو شــۆڕش دەکــەین ، تا ســەرجــەمی ئەم دنیــایە لە ئازار و نامـرۆڤـایەتی و بـرسـێـتی ڕزگـار دەکـەین.( برایم هەنـاسـەیەکی قـوڵی هەڵـکێـشـاوسـەری لەسـەری زارا نزیکخسـتـەوەو تەنکە مـاچێکی لێوەکانی زارای کرد).

ـ ئەی زارای جوانم ، دەزانم دڵت قوڵپی شۆڕشی گەرموگوڕی تیدایە، وەلـێ تـۆ بـەم نـاسـکـی و نـازداری و پـەروەردەی ئـاو و هـەوای بەهەشتەکەی هەورامان ئەو ڕێگە سەختە چەند مانگییەی بیابانی وشک و بێ ئاو بەتۆ نابڕدرێ ، دەزانم تۆ نمـــونەی ئافـــرەتێکی شۆڕشگیری سەلاری کوردی خۆڕاگریت ، ئێرەش پێویستی بەهێزێکی وەکی هێــز و بڕوای پاکی تۆ هەیە، جـلـّـەوی شـۆڕشی ئێـرە بگرەو لەکارەکانتا بەردەوام بە، تۆ سمبۆڵی ئەو ڕاستیەی کە خوای سروشت تۆی بەم ناسک ونازداریە دروستکردوە .غەمت نەبێ من دەگەڕێمەوە وەلێ نازانم کەنگێ ، ژیانمان دەبێ وابێ ، وولات ونیشتمان وکەس وکار وخۆشەویست بەجێهێشتن سونەتی ژیانی مرۆڤە شۆڕشگێڕەکانە، تۆ و هێــزی تۆ ، توانای تۆ ،کـۆمـەکی تۆ، بوونی هاو هەنگاوی تۆ نەبوایە من سـەرکـەوتنم بەدەست نەدەهانی ، تۆ ئافـرەتێکی کـوردی خۆڕاگری دەبێ ئەم ڕۆڵە ببینی .

برایم هەر ئەو ڕۆژە هەوادارانی دەنگ دا بۆ سەفەرێکی دوور ودرێژ بۆ شۆڕشێکی نوێ خو ئامادەکەن ، بەیانێکی زوو بوو کـاروان ئامادەی سـەفـەر بوو. دڵدارەکـان چارۆکـە مـاچیـان بۆ یەکـتـری دەپێـچـایەوە وهەریـەکـە لە گـۆڕەپانی ڕۆیشـتـنا هاوژینەکـەی لە ئامـێـز گـرتبـوو. برایمیش سەری زارای لە باوەشدابوو و لەگەڵ ووردەماچدا قسەی بۆ دەکرد لەدواچرپەی سوزیدا باوەشێکی گەرمی بەزارادا کردوو جلـّەوی کـاروانی بەرەو خوار ڕاکـێشـا ڕۆیشـتن . چەندڕۆژ چەند هەفتـە چەند مـانگ بیـابانی سـەخت وگەرم و بێئـاویان بڕی . لەناو کـاروانەکـەدا شـۆخـە کـچـێکی پێگەیوی مـەمک هەڵـتـۆقـیـوی هەورامی ، شـۆخـە کچێک هەر لەسەردەمی کچێتیەوەی لە پاوەوە لەتەک کەس وکاریدا

دوای ڕاستـیـەکـەی برایم کـەوتبـوو . لە بیـریدا زرنگ بـوو ، لەکـاردا چاپوک تـەنیا و لـەشی گـوڵـێکی بۆن نەکـراوبوو . تا حـەز لە دەروونیـا باڵابوایە گۆپکەکانی مەمکی ڕۆژ بە ڕۆژ تیژتر وتیژتر دەبوون . هەر لە دوورەوە گـۆپـکەکـانی هەڵاوی حـەزی دەمی نێـرێنەیان هەڵدەمـژی . کـــۆمــەکی برایمی هەڵبــژاردبوو، لە پشـــوداندا ئاوی بـۆ دەبرد . لە فرسەخی لادانی کارواندا خەپلەی گەرمی بۆ دەکرد . شەوێـک ، دووان ، چەندان شــەو و ڕۆژ تەنیــا ڕۆح بـوو ، ڕۆحی گــڕگــرتـوی بۆ لەشی تووکاوی و هەڵاوی دەمی نێرینەیەک کڵپەی گرتبوو. هەر تەنیا بوو. شــەوێک لەشــەوانی تەنیــایی جــەوەندەیەک ئاو و چەند خــەپلە کولێرەیەکی هەورامی بۆ برایم برد، لە ناو خێوەتێکی تەنیادا ئەم دوو تەنیایە ئاگری حەزێک لەجەستەیان هەڵچوو.

ئەم چاوە پڕ کلانەی، ئەم دەست و پەنجە پڕ مستیلانەی، ئەم قەبرغە و سمتە خرپنەی ، کە دەڕوات و هەڵدەسوڕێت مەمکەکانی لە چەشنی دووخــونچــەی نەپشکوتوی گــۆپکە تیـــژی هەڵـوەریوی ســەر ئاوی جۆگـەیەکی کـەم خوڕ دەچێ ، بانگم دەکـەن بۆ مژینی شیلەی حـەزیان بۆچی نا ؟! سێکس بەشێکە لە لۆژیک (منطق) لۆژیکیش بەشـێکە لەڕاســـتی، ڕاســـتــیش خـــوایە، کـــەواتە وەرە چاو نەخـــشـــین با تەنیــاییــەکـەمــان لەم شـەوە تاریک و تـوونەدا ، لەم بیـابانە چۆڵ و وشکەدابە مـاچ بڕەوێنینەوە . دەزانـم گـۆپکەکـانت شـاڵاو بۆ هەڵاوی دەمی نێـرینە دەبەن . دەزانم گـڵـپـەی حـەزی سـێکس و مـاچ خـەریکە دەروونت شەقار دەکەن . وەرە منیش گڕی حەزی سێکس و ماچ و باوەشی زارای جـوانم لێبـڕاوە، وەرە چۆن زارا بوو بە هاوبیـر و هاو هەنگاو و کـاروانی خەباتم ، وا تۆش بووی بە هاوڕێ و هاو هەنگاو، هاوبیرو هاو قوناغـێکی تری ژیانم، هەردوولامان پێـویستمان بەیەک هەیە، دووتەنیـا، دوو دەروونی پڕ حەزو شەهوەت ، دوو لەشی تینوو، دوو ڕۆحی گڕگرتوو، دوو شۆڕشگێڕ ، تۆ بۆ باوەشی زبری توکاوی من و من بۆ باوەشی نەرم ونیـانی تۆ، وەرە سـێکس گـوناه نیـە، سـێکس

بەشێکە لەژیان ، ژیانیش مۆڵەتی سروشتەو بەمرۆڤ دراوە .
ـ وەرە با ئەو مۆڵەتە بەتەنیا بەسەر نەبەین ، وەرە هاجەری گرگرتوو ، شەوەکەمان پڕ عەتر بکەین ،عەترێ کۆرپەی ڕۆحمان ڕاژەنێ .
ـ ئەی تۆ دەڵێی چی هاجەر خانم ؟ .
هاجەرچاوە ڕەشەکانی پڕکرد لەناز وحەزو شەهوەت.کەمێک لە برایم نزیککەوتەوە .
ـ هەی برایمی ڕابەر، ووشەکانت هەریەکەیان پەیامێکی خوای پێوەیە ، یانی حەقیقەتن ڕاستین . ئەی گوایە ئێمە لەپێناوی چیدا وا نیشتمان و خاک و کەس وکار و هەورامانی بەهەشتمان جێ هێشتوە و لەم بیابانە لماویە گەرمەدا خەریکین لەژێر تیشکی خۆری تێژڕەودا دەپڕوکێین ، گشتی لەپێناوی گەیاندنی ڕاستی یە بە کۆمەڵگا دواکەوتوەکان، ئەو کۆمەڵگایانەی نازانن ڕاستی چ تام و کەڵکێکی هەیە، چ بەرهەمێکی هەیە ، ئا.. برایمی ڕابەر و مامۆستای ڕاستی، هەروایە، زۆردەمێکە دڵم خورپەی حەزی تۆی تێدایە . زۆردەمێکە حەزدەکەم ئەو دەم و لێوە قاوەیی یە پڕخوێنەت بمژم ، بۆنی ئەوسمێڵ و ریشەڕەشە پڕەت هەڵمژم ، ئەو دەم ولێوەی هەزارەها ووشەی ڕاستی ، جوانی ، مرۆڤایەتی لێدەتکێ ، ئا.. برایم حەزدەکەم هەر ئەمشەو نەرۆمەوە و لە نێو ئەم خێوەتەدا لەباوەشت بگرم .تا خوای خۆشەویستی حەزدەکات لێوت بمژم ، نا ئۆقرە ناگرم ڕەنگە تا سبەینێ حەزی ماچت جەستەم بسوتێنێ. .ئاخ تۆ نازانی زۆر دەمێکە ڕۆحم چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەیە، ئەم شانسەیە.
برایم هەر ئەوشەوە ناردی بەشوێن کەس و کاری هاجەردا ، قاپێ خورما...تاسێ دۆ ..چەند خەپلە کولێرەیەکی هەورامی بوو بە شەکراوی شەوی زاوایەتی ، پیرۆزیان کرد، خێوەت چۆڵ بوو.
مانگە شەوێکی ڕووناک بوو، کاروان لەخەوێکی نەرم و کەنەفتا بوو، دەنگی پڕمە وکاوێژ و شڵپەی لچی هوشترەکان نەبێ هیچ نەدەبیسترا هاجەری باڵابەرزی لەش گرگرتوو . هاجەر دەیویست لەیەکەم شەوی

ڕووتیانەوە سەرتاپای جوانی خۆی نیشانبدا لە بالآترین شوێن تەنیشت کۆڵەکەی ناوەڕاستی خێوەتەکەوە وەستا. باڵای لەوی نەبێ جێی نابێتەوە ، بە نازو کەشخە ونیگای پڕ شەهوەتەوە دەیڕوانیە برایمی دڵ تینوو ، عەیارانە وبەئەسپایی کراسە ئاودامان و دەرپێ کوردیەکەی داکەن و قۆڵ و ئەژنۆ خرپنەکانی بەڕووتی دەرخست برایم لەسەر لبادێکی ئەستور دانیشتبوو دەمی ڕۆحی بۆ لەشی خەپانی هاجەر ئاوی تێزابوو .

ـ هاجەر دەزانم جوانی ، دەخێراکە هەموو جوانیەکەتم نیشان بدە ، دەی خێراکە دیاری ئەم سروشتە ئاشکرابکە .

هاجەر ژێرکراسەکەی داکەن ، باڵایەکی سەرتاپا ڕووتی پێست گەنم ڕەنگ و دوومەمکی قنجی هەڵتۆقیووی گۆپکە قاوەیی ، تۆپەڵێ مووی قەترانی ئاڵۆسکاوی بەر موسەلانی تەڕی . پوزی ناسک ، ڕانی خرپن ،گەردنی نەرمی ، چاوی گەشی قژی درێژی و قۆڵ و باسکی جوانی دەرخست ڕووناکی ئاگری قوتیلەی نێو خێوەتەکە لایەکی لەشی ڕووناک کردبۆوە، لاکەی تریش تەمێکی جوانی بوو . تیشکی مانگە شەوە کەم هێزەکەش لە کوونی شاشی خێوەتەکەوە بۆ جوانیەکەی هاجەر دزەی کردبوو کۆمەڵە خاڵێکی ڕووناکی کاڵی لەسەر ڕوو ، سنگ و گومەزی مەمکە قنجەکانی و قولآی ناوکی و ڕانەکانی نەخشاندبوو و وێنەیەکی جوانی دەنواند . برایم بووبە پارچەیەک لە شەهوەتی گڕکرتوو و لەسەر لبادە خوریەکە هەستایە سەرپێ .

ـ وەرە هاجەری جوان باپێکەوە چەند ڕکات نوێژی سروشت بکەین، ئەو نوێژەی خوا بەکردنی لێمان ڕازی دەبێ و ئەو بازیە ڕۆحییە بکەین کە خوا حەز بەبینینی دەکات، وەرە وا دڵم خەریکە ببێ بە پارچەیەک تەڕی و لە سینەوە فیچقە دەکا.

هاجەر بەوردە هەنگاوێکی پڕ نازەوە هاتە پێشەوەو باوەشیان بەیەکداکرد، هەردوو هەر ڕووت، لەیەکەم گەیشتنی هەڵاوی دەروونی

برایم وگـۆپکەکـانی هاجـەر. هاجـەر تـەزوویەک ئەژنۆکـانی شلکردو بەسەر باڵای برایمدا نوشتایەوە، لەژێر تیشکی ووردی مانگە شەو و ڕووناکی قوتیلەکەدا ، لەیەک ئاڵان و مـانگ هەڵویستەیەکی کرد و چاوی ڕووناکی فـراوان کـرد ، تا ئەم دووعـاشق و شـۆڕشگێـرە لە جـەسـتـەو ڕۆحی یەکـتـری تێـر بخـۆن ، برایم چەشـەی لەش و لاری ناسکی زارا ئاگر تێبەربوو ..هاجەر خانمێکی تەمەن نەمامی و ڕۆح کـڵـپـەدار یەکـەم جارە پیـاوماچی بکات ، یەکـەمـجارە لەشی زبر و توکاوی پیاو مەمکەکانی و گۆپکەی سمتی ختوکە بدا... ماچەکان دەبوون بەوورده گـاز.. گـازەکـان دەبوون بەتـەکـان، تەکـانـەکـان دەبوون بەیەکـتـری جـەڕان و باوەشی گـەرم ، گـەرم ، گەرم هاژەهاژی هەڵاوی دەروون گەرم داهات و بوو بە سیمفۆنیای ئۆف، هاجەرێک پەروەردەی شاخی بڵند و ئاوی سازگار و هەنجیری تەڕو ترێی سەرقوڵە و هەرمێ ناسکە وگـوێزی چەوری هەورامـان لەبیـابانێکی ووشکی لمـاویدا ، لەباوەشی زبری پیـاوێکدا دەبێ چ گڕی بگرێ ، دوای تەوژمە تەکانێ ، باوەشـە مـاچێ هەروولایان پێکەوە تەواو بوون ، تەڕبوون،تووکـە ئاڵۆسکاوەکانی بەر موسەڵانی هاجەر سووربوون ، سووربوونێکی بێ سنور.

( ئای ئەمـە گـشـتی حـەزە وا دەرگـای لەسـەر دەکـرێتـەوەو بە هوروژم فیچقە دەکا . )

هاجـەر سـەری ئارامی دوای تەواو بوونی خـسـتـبـووە سـەر سنگە توکاویەکەی برایم :

ـ ئای کەخۆشە برایم ، ئیتر لە دوورەوە سەیرت ناکەم ، ئیتر لە دووروە مژی حەز لە دەم و لێوت نادەم و هەر لە دوورەوە گوێ لە قسە بەنرخ وئامـۆژگـاریەکـانت ناگـرم . ئای کـەخـۆشـە برایم گـیـان هەناسـەمـان تێکەڵاوی یەکـتر دەبێ ، ئیـتـر بە شـەو لە ناوجێگەدا باوەشی ڕووتت پێدا دەکـەم و بەڕۆژیش لە پشت هوشـترەکەتەوە، ئا.. نامـەوێت یەک چرکە بۆنت لە سینەم ببڕێ و لێت جیا ببمەوە .

هێشتا نەگەیشتبوونە جێ مەبەستیان، شەوێک لەشەوانی باوەشی ڕووتیان هاجەر مژدەی هاتنی کۆرپەیەکی بە برایم گەیاندو ئەم هەواڵە بوو بە هیوای چاوەڕوانیان ٠

دوای چەند مانگێ کاروانی ڕاستی گەیشتنە وولاتێکی لماوی بێ ئاو و بێ نان وقرچە ، کۆمەڵە مرۆڤێکی برسی شەڕانی کۆمەڵگایەکی پڕ دووژمنایەتی دژی جەردەی ئاشووبە . هەر لەیەکەم ڕۆژەوە قوتابخانەی دانان، سەرەتای شۆرشی دەست پێکرد ، کەسانێکی زۆر باوەڕیان پێهانی ، کەسانێکی زۆری خێڵی قورەیش هەڕەشەیان لێدەکرد.

ـ ئەم کوردە سەرسەختە چی گەیاندیە ئێرە وا خەرێکە بتەکانمان ترۆ دەکا ، کولتورەکەمان پیس دەکا، بازاڕەکەمان سستدەکات .

برایم لە غەمی بەگەیاندنی پەیامەکەیدابوو٠ هاجەر لە چاوەڕوانی هاتنی هیوا وبەرهەمی عەشقەکەیان ٠ دوای چەند مانگێ کۆرپەیەکی ئێسک سوک و چاو کاڵی نەرمۆڵە لە گڕەی وولاتێکی پڕعەجاجدا، (سمایل ) لەدایک بوو . برایم بووبە باوک ، هەڵیدەپەڕاند ، ماچی دەکرد، هەردووکیان دەیانلاواندوە، هاجەر شانازی بەوەوە دەکرد هێزی بەردەوامی بیر وباوەڕی برایمی هانیوەتە بەرهەم . ( سمایل ) پێیگرت و زمانی پژا، زمانێکی پڕ مۆسیقا و سۆزی جافی و هۆرەی هەورامی، هەر لەیەکەم ڕۆژی زمان پژاندنیەوە فێری بانگی حەقیقەتەکانی کرد، زرنگ بوو، جێی هیواو خوشەویستی بوو .

دابڕانی لە زارای هاوسەرو هاوخەبات و هاوژینی دەمێک بوو خانەکانی لەشی برایمی ڕاچڵەکاندبوو .

ـ دەبێ بچمەوە بۆ لای زارا . دڵنیام زۆردەمێکە لە چاوەڕوانیەکی سەختدا دەژی . گەرەکە ڕاستی هاجەر و بوونی سمایل و بەرهەمی شۆڕشی ئێرە بزانێ . دابڕانەکەمان درێژەی کێشا ، ئەمەش تاوانە لە هەرسێکمان، لە زارا ، لە هاجەر ، لە خۆم . لەڕاستی وا چەند شەوە باوەش و ماچ وسێکسەکانی هاجەر، بەتام وناو وحەزی زاراوە دەکەم ئەمەش تاوانە لەڕاستی ، دەکرێ . دەبێ منی ڕابەڕی ڕاستی لە

هەموو کەس لەگەڵ خۆم و هاوسەرەکانمدا ڕاستگۆتربم. ئا دەبێ برۆم و بگەمە ئەو دەروونە چاوەڕوانیە گرکرتووەی زارای بەرزم . پێش چەند ڕۆژی هاوڕێیانی دەنگدا: دەگەڕێینەوە بۆ مەڵبەندی یەکەممان خۆ ئامادەکەن ، هوشترەکانتان تێر ئاو و ئالیک بکەن ، ئەم سەفەرە کتوپڕە هەواڵێکی دڵتەزین بوو هاجەرخانمی تەزان ئۆقرەی لێهەڵگیرا .

ـ بەچاوەکانیا دیارە نیازی نیە هاوکاروانی بم .

هاجەرکەوتە پاڕانەوە :

ـ برایم گیان منیش بەرە ، لەم بیابان و وولاتە گەرم وبێ ئاو و نامۆییەدا تەنیام مەکە ! تۆ نازانی من تائێستا لەجافی زیاتر زمانێکی تر نازانم ؟ توو خوا توو گەورەیەکی تەنیام مەکە .

ـ نا هاجەرخانم تۆ دڵی ئاگردانیی شۆرشی ئێرەی ، ئێمە پەیامێکمان هەیە ، ئەو پەیامەش لەبەردەوامی شۆرش و خۆڕاگریدا سەردەکەوێ ، وەک چۆن زارای نازدار لەوێ ڕابەری گەرمی شۆڕشە ، تۆش لێرە سمبۆلێکی .

ـ نا صفا گیان ، نابرایم من بێ تۆ ئۆقرەم نیە ، هەردێم

(چۆن لێرە خیمان مرکی نالی اوو زرعی فیه عشرتی کم)

(بوجی رجی دنو مالت فیه بیدی سارکی یاکورت کمه)

(برویشی یچ و یثری زنکه بول نکی تینوت نابی بوجی ملائکه کمه)

(بوللهی کجبریل قیت لات بزره رمی ادم ربی بو و کمه)

(زنشی وشونی را کابانکی کا صفامروه برجی وفات مکه)

(به للهی صوت جا تتبو روا وهاورد برئی جی بکم ضومو م نتباکور بکمه)

(کو زفت هو رامی شتی جافی نازانی زامی او وها کمه)

ک مری باری تیت مالی بزر دکا زم زمش مومی وها اوی کمه) .

هاجەر دەیزانی ڕۆحی چ سەختیەک بێ برایم دەکێشێ ، چ ئازارێکی دەروونی بێ برایم دەچێژێ ، سمایلی دا بە لایەکی شانیدا و بەگریان

و پاڕانەوە دوایان کەوت٠
ـ صفا مەڕۆ ... صفا مەڕۆ ... صفامروە
ئەم کۆچەی برایم و کوڕوزانەوەی هاجەر بوو بەسمبۆلێک تائێستاش هەموو ساڵێک حاجیەکان یادی دەکەنەوە ٠
وا چەند ساڵە زارای ناسکە ژنی هەورامی ، دڵی حەزەکانی دەگوشێ و هەمیشە لە چاوەڕوانی دەنگی زەنگی کاروانداێە ، کاروانێک مژدەهەڵگر وسوێندی بەڵێنی بێ٠
ـ ئا زارا گیان تۆبە، ئیتر جارێکی تر لەیەک ناپچڕێین و بەتەنیا بەجێت ناهێڵم، ئا ، تۆبە، زارا تۆبە ئەم سوێندەم دەوێ.
مژدە، ئا ، شۆرش بەردەوامەو کۆمەڵگایەکی گەوج و چەند خێڵێکی شەڕانی لە دزی ، درۆزنی مرۆڤکوشتن، تالانکردن، ئافرەت خنکاندن، ڕزگارکرد٠
زارای ناسک ، زارای بەوەفا و شۆڕشگێر بەو دڵ و دەروونە پاک و هەستە گەرمەیەوە ، هەمیشە لە چاوەڕوانی برایم دا بوو . پاش نیوەڕۆیەکی زەرداو بوو، لەناو هۆزی برایمەیەکاندا بوو بە قاو، منداڵان بۆ باوکیان ، ژن بۆ مێرد و دڵداران بۆ پارچەیە لە دڵیان ، تەپووتۆزی کاروانێک لە دوورەوە دیارە وبەروە ئێرە بەڕێوەن . تا بێ نزیکتر ونزیکتر دەبونەوە ، پیاوانی لە ژن دابڕاوی چەندساڵە هەر لە دوورەوە چەفتەی یادگاریەکانیان هەڵدەسوڕان ٠ زارا لەکوخەکەی هاتە دەرەوە٠
ـ دەبێ ئەم کاروانە برایم یان لەتەکدا بێ ، خوایە خێر بێ دوێنێ شەو خەومدی چەپکە گوڵێکی ڕەشی دامێ ، دەبێ ئەو بێ و نەخۆش بێ یان غەمێکی هەبێ ، دەنگیان دیارە ، وا کاروانی هەورامیەکانە لە دوورەوە هۆرەی جافی دەکێشن. تا نزیک بکەوتنایەتەوە هەناسەی عاشقەکانیش نزیک دەبووە ، برایمی سەرکاروان هەر لە دوورەوە لەسەر پشتی هوشترەکەیەوە ملە قوتێ بینینی باڵای بەرزو چاوی گەش و قژە کاڵە خورمایەکەی زارا بوو کاروانی برایمەیەکان گەیشت،

چەند سەرمەڕ سەربڕا ، دەست لەملانی عاشقانی چەند ساڵ دابڕاو بوو بە بەهەشتێکی ڕۆژ بوو .
دوای باوەشێکی گەرم و چەپکە ماچێکی شەرماوی ، زاراو برایم خویانکرد بەباوەشی کوخەکەیاندا . زارای نازداری ڕاهاتوو بەگەرمی و تامی ماچەکانی برایم ، تێگەیشت ئەم ماچە شەرماویە پڕ ترسانەی برایم نهێنی یەکیان تیدایە ، دەستێکی هێنا بەتەوێڵ و ڕووە ئارەقاوی و لماویەکەی برایم دا، ووتی :
ـ هەی ڕابەر و هاسەری شیرینم دۆێشەو خەومبینی خەوێکی غەماوی و چەپکە گوڵێکی قەترانی ، هیوادارم ئاسودەبی .
( برایم هەر بێدەنگ بوو )
ـ لەوە دەچێ زۆر ماندوبیت .. یان غەم وگرفتێکی سەختت هەیە و نەتوانی زۆرانی لەتەکدا بگری ، ئەگینادوای چەند ساڵ دابڕان و چاوەڕوانی ئەم شەوە مەیوی و ئەم ماچە ساردە پڕ ترسانە نهێنیەکی لەپشتەوە هەیە .
ـ زارا خوای گەورە تەنیا جوانی پێ نەبەخشیویت، ئەو چاوانەت لەتەک ئەوەدا پڕن لە حەز و ئارامی و ئازایەتی ، لە ناخیاندا زرنگیەکی بێ سنوری هەیە، زرنگیەک هەموو نهێنیەکانی بەرامبەرت بە سەیرکردنێ تێدەگەیت . ڕاستە زارای جوانم ، گرفتەکەم درکاندی ڕاستیەکە ، نازانم چۆن دەست پێبکەم ؟ دەبێ بیڵێم ، وەلێ توو جوانیەکەت و توو پاکیەکەت زویر مەبە و لێم تێبگە ، گەر هەڵەش بوو لێم ببورە .
لەناو کوخێکی قوڕینەدا و لە نێوان دووعاشقی چەند ساڵ لە یەک دابڕاودا، تەنیا ووردە چرپە و ووشەی ترسیاوی نەبێ هیچی تر نەدە بیسترا . کوخەکانی تر تاساوی بەیەکگەیشتنی حەزەکان بوون هەناسەکان دەگۆڕانەوە و لەشە تینوەکان یەکتریان دەلستەوە ، دەتلانەوە، چرپەکانیان بەووشەی بەقوربان دەڕازانەوە گڕە دەروونیەکان لەباوەشدا ساردەکرانەوە ، تەنیا برایم و زارا لەگرفتی دوزینەوەی

سەرەداوی کلاڵفە ئالۆسکاوەکەی دەروونیان بوون.
ــ ئاخ خـوایە ، خـۆرپەکـەی دڵم بەڕاسـتی نەگـەڕێ ، گـوڵی دەسـتی عەشقمان ڕەشهەڵنەگەڕێ .
ـ برایم من پێم وایە تا زووتر ئەو نهێنیەی تاساندووتی، ماچەکانتی ترساندوە بیدرکێنی باشە ، تاکەی دەتوانی دڵت بکەی بەحەشارگەی نهێنیـەک و لە نزیکتـرین کـەسی ژینت بیـشـاریتـەوە ؟ . تۆ ڕابەری بیـرێکی ، سـەرکـردەی شـۆڕشـێکی ، شـۆڕشـێک بتـەکـانی هەورامـان وقــورەیشی ڕمــان، ئـێــســتــا بۆ وادامــاوی؟ من دەزانم چاوەکــانت چیرۆکێکی تیا حەشاردراوە، تا زووە بیدرکێنە، باشەوەکەمان هەروا بە مەیوی و ساردو سڕی و بێ بزەو ماچ وگاز و باوەش ڕۆژ نەکەینەوە چیت هەیە بیـڵێ . تۆ نازانی ئەم ڕۆح و جەستـەیەی من چەند سـاڵە چاوەڕێی ئەم شەوەیە؟ چاوەڕی ئەو هەناسە و بۆن خۆشـە پڕ حەزەیە ، نەک سـیـەکـانم بەڵکو ڕۆحم تینوی هەناسـەتە ، هەناسـەیەک لەیەکـەم ساتی ژووانی لێوەکانمانەوە ڕۆح وسیەکانم بێ هەناسەت ئۆقرەی نیە ، بابەس بێ ئەم تینویتیەی ڕۆح وچەستـە ..دەئازابە و ئەو نهـێنیـەی تاساندوتی بیدرکێنە .
برایم سەری داخستبوو، پەنجەکانی دەستی لەیەک ئالاندبوو، سەری بەرزکـردەوە بۆ ئاسـمـان ، وەک داوای یارمـەتی لە کـەسێـک لە خـوی گەورەتر بکات.
(ئەی خـوای گـەورە ، من دەمـەوی بەیارمـەتی تۆی مـەزن شـۆڕشـێکی سەرانسـەری بکەم ، گشت مرۆڤایەتی لە گەوجایەتی و چەوسانەوەو ئاشـوب و شەڕو شـۆڕ ڕزگـار بکەم و لەپێناوتا هەزارەها مـرۆڤ ژیانی لەدەست دەدا، لەپێناوتا هەمـوو کـەس و کـارو بەهەشـتی هەورامـانم بەجێ هێـشت، بتی ژوورەکەم سوتاند، سلم لە خێزان لە پیاوە ڕیش درێژە درۆزنەکانی هۆزەکەم نەکردەوە ، ئێستا بۆ زمانی درکاندنی ئەم ڕازەم بۆ زارا نیە؟ ئا.. ئاورێکی بەلای زارادا دایەوە ) .
ـ دەزانی تۆ زۆر لەوە بەرزتری ، زۆر لەوە بەنرختری،خۆشەویستی بویە

زاتم کاڵ بۆتەوە ، دەستی خستە دەستی زاراوە پەنجە توکاویەکانی بروسکەی حەزێکی لە ڕۆحی زارا دا ، زۆر دەمێکە ڕۆحی زارا ئەم گەرمیەی لێ بڕاوە زۆرتری گەرەکە.

ـ زارای شیرینم ،(شەوێک لە شەوان ، شەوانی تەنیایی و ماندووبونی جەستە و ڕۆحم ، هەستێ هات ودڵی گوشیم ، حەزم بوو بە کلێپەیەک و باڵای ئافرەتێکی گرت . دەروونی هەردووکمان بوو بە پارچەیەک گڕ و شاڵاوی بەرەو ئاسمان دەبرد ، بەیەک گەیشتین ، ئێستا ئەو دایکە و من باوک.

چاوەکانی زارا پڕ بوون لە ئاو، دڵی گوشرا ، لێوە تەڕە چاوەڕوانەکانی چەند ساڵەی ووشک هەڵگەڕان .

( بە کزی وگەرویەکی پڕ قوڵپەوە ووتی )

ـ یانی ژنت هێناوە ؟!

ـ ئەرێ !

ـ کێ یە ... ؟

ـ ئێستا لەکویە ؟

ـ لە حیجازە !

ـ ئەمەش تاوانە ، چۆن ئێستا دڵی من ژاندەکا و چ ئازارێک دەکێشێ دڵی ئەو ئافرەتە داماوەش لەوێ دەکوڵێ ! ئاخ ئێوەی پیاو بۆ ئەوەندە زاڵمن، هەر چەند ڕۆژێ چاوتان لە ژنەکانتان نەبێ، خورپەی حەزێکی تر وەک قارچک لە دڵتانا هەڵدەتۆقێ . ئێوە نازانن دابڕانی مێرد لە ژن چ ئازارێکی بۆ ژن هەیە ؟ سارد بوونەوەی جێگەی نووستن و باوەش و بڕانی دەنگی ماچ و هەناسە و دەستکردنە ملی تەنیا چ نەگبەتییەکە و یەخەی ژن دەگرێ!! ئاخ کێ بێ ئەو ئافرەتە بەدبەختەی ئەو لەو وڵاتە لماویەدا بە تەنیاو لەگەڵ کۆرپەیەکدا منیش لێرە ، هەردووکمان چەوساوەی حەزی تۆین، ئافرەتی ئەو دەڤەرەش بێ باشتر کەمێک غەمەکانی لەهی من ناچێ وەک من بەهەشتی هەورامانی لێ وون نابێ کەس و کاری لێ بزر نابێ ، ئاخ ئەو نەگبەتە کێ بێ؟

ـ نا ئافرەتی ئەو دەڤەر نیە و هاجەرە ، هاجەری هاو سەفەرمان ، هاو بیر و هاوکاروانمان و چارەنوسمان ! .
ـ ئای برایم تاوان ، تاوان ، چۆن دڵت هات لەگەڵ کچێکی کەم تەمەندا زەماوەند بکەی ؟ . دایکێکی گەنجی دڵگرتوو لەنامۆیی و چۆڵەوانی لەگەڵ کۆرپەیەکدا بەجێبهێڵیت چۆن دڵتهات . ئاخ تا نهێنیەکان زیاتر بدرکێنی تاوانەکان کەڵەکە دەکەیت ؟ جارێک تاوانێکت کرد کە چەندساڵ منت لەم چۆڵەوانی و نامۆی و بێ خوراکی ڕۆحە بەجێتهێشتم . ئینجا هاجەر ، ئەی هاجەری جوان ، دەبێ ئێستا قوڵپەکانت چەند بەکوڵ بن و فرمێسکەکانت چەند بەخوڕ بن . ژن ومنداڵێکی بێ باوان زمان نەزان ، نامۆ بە هۆز و دەڤەر، ئاخ برایم تۆ ڕابەری پەیامێکی پیرۆزی ئەمەت بۆ کرد ؟ ئەی نازانی ئافرەتیش وەک پیاو مرۆڤە؟ ئاخ پیاوان بۆ وادەکەن ؟؟
زارا لەسەر لبادەکە پاڵکەوتوو پشتی لەبرایم کرد ، دەستێکی خستە ژێر سەریەوە و دەستێکی خستە سەردەمی حەزە تەمەن درێژەکانی ، چەند ساڵ دابڕانی دەروونی جەنگەڵێکی ئازار بوو بەتەنیا گنگڵی دەخوارد . ناخی دەکولا...بەبێ دەنگی بەکوڵ دەگریا ، لەگەڵ تۆرانی زارادا سروشت توڕە بوو، چۆن جگەرکۆشەیەکی وەکی زارام ئازاردەدەی؟ مانگ لەزەوی تۆراو خۆی لەناو چەند پەڵە هەورێکی چلکندا حەشاردا و عاشقانی ڕووتی لەیەک ئالاوی ناو کوخ و ڕەشماڵەکانی لە ڕووناکی کزی خۆی بێ بەشکرد.
وا چەند شەوە غەم وبێ دەنگی وسارد و سڕی جێگە و بەجیا نووستنی دووعاشقی چاوەڕوان دڵی کوخەکەیان دەگوشی .
برایم بەکزی و نەگبەتیەوە پاڵی دابوو بەدیواری کوخەکەیانەوە و لە زویریی زارادا تاسابوو .
زارا دەستەکانی لەکلاوەی ئەژنوەکانی گیرکردبوو ، چاوی بڕیبوە قولای ڕووناکی دەرگای کوخەکەیان ، پرسیارەکانی دەروونی گلۆڵەیەکی ئالۆسکاوی غەماویبوون .

برایم (بەدەنگێکی کزو کەساسیەوە ڕووی لە زارا کرد و ووتی ) .
ـ زارا گیان تاکەی وابین؟
زارا ئاوڕێکی لە برایم دایەوە ،پرسیارەکانی دەرونی بوون بە چەپکە تیشکێک وئاراستەی چاوە پڕبەزەییەکانی برایمی کرد .
ـ زارا جوانم توو جوانیەکەت ، توو پاکیەکەت توو ئەو ڕاستیەی عاشقی بووین ، توو ئەو ڕاستیەی شەیدای بووین لێم ببورە، زارای نازدار ڕێگەی ئێمە زۆر دوورە، ئەرکی ئێمە زۆر سەخت و دژوارە لێم ببورە ، ئەم تۆران وئەشکەنجە ڕۆحی وجەستەیەی ئێمە چارەسەری هەڵەکان ناکات... وەرە بڕوانە ئەم دڵە گرتووەی ئۆقرەی بۆ ماچێکت ، بۆ ئاهێکت نەماوە، ڕۆحم تینوی هەناسەتە ، لێم ببورە، ئەمە ژیانە، ێئمەش مرۆ ڤین ، مرۆڤیش ئەم چیرۆکانە دروست دەکات ، وەلی سوێندت بۆ دەخۆم هەرتاقانەکەی ئەم دڵەی ، تۆ و هاجەر دوو نمونە و دیاری ئەم سروشتەن وبە پاکی بەخشراون ، دڵنیابە ، دڵنیابە زارای جوانم حەزەکانم ، هەستەکانم بێ کەموکوڕی لە باڵات دەگرم ، وەرە شیرینەکەم بائێتر بەسبێ ئەم زوخاوە ڕۆحیە ، بائێتر بەس بێ ئەم شەوە مەیوە ،دەبێ بگەینە ئەنجامێ، شەوێ زوتر ، چرکەیەک ، ساتێ خیراتر ، ڕۆحمان تینوێتی دەشکێ و لەم ئەشکەنجە ڕۆحیە ڕزگار دەبین.
( لەگەڵ ووشەکاندا چاوەکانی برایم کەوتنە سەر ئاو، ئاوێکی تەنک ئاوێک حەزی ناخێکی نیشان دەدا وتک تک بەسەرڕوومەت وڕیش وسمێڵە پڕەکەیدا دەتکان ) .
زارا لەناخدا تەتەڵەی بە هەردووسەری چمکی کێشەکە دەکرد.. وا چەند ڕۆژە تۆپەڵێ گڕی سێکس لەکوخەکەیاندایە و ڕۆحی سڕی چاوەڕوانیتی گەرم نەکردۆتەوە .
( ئەم مانگرتن و توڕەبوون و ڕۆح سڕبوونەش تاوانیکە و من بەرابەر خۆم دەیکەم و چارە نیە ئەمە ژیانە ). چاوەکانی گەشکرد پرچەکانی واڵاکرد ، چەند دوگمەیەکی سەرسنگی کراسەکەی ترازن و درزێکی

ساف وناسكی نیوان مەمکۆڵەکانی دەرخست ، لەپاڵ دیواری کوخەکەیاندا و لەسەر لبادێکی ئەستوور چەپکە نیگایەکی لێبوردنی لە برایم گرت ولەش ورۆحی برایمی بۆ لای خۆ ڕاکێشا ، برایم پێش ئەوەی گڕی لێوەکانی زارا قوتبدا سەری پەنجەکانی زارای مژی و تەزوی لەجەرگی هەڵسان و ناوچەوانی ماچکرد . توند نووساندی بەخۆیەوە ، پێش ئەوەی ڕووت ببنەوە هەردولایان بۆ چەند جارێ وەک گەرەکیان بێ تینویەتی سیەکانیان بشکێنن و هەستی بۆنکردنیان تیژکەن، برایم پرچەکانی زارای لەسەر دەستی ڕاخست لەگەڵ وورده ماچدا بۆنی دەکرد ، زاراش دەستێکی خستە نێو سنگە توکاویە ئارەقاویەکەی برایم و پەنچەکانی لە ئارەق و بۆنی سەنگی هەڵکێشا و پەنجەکانی دەرهانی لە دەم ولێوی وخۆی نزیکخستەوە وچاوەکانی نوقاندو پڕقەبارەی سیەکانی بۆنی پەنجەکانی هەڵمژی . ڕووت بوونەوە، برایم بە وردە ماچی بە قەبرغەی زارادا سەرکەوت ،لە مەنزڵی مەمکەکانیا هەڵوێستەیەکی بە لێوەکانی کرد سەری زمانی بە ژێر نەرمی نەرمۆڵەکانی مەمکی زارادا هانی.. گۆپکەی مەمکیکیانی خستە نیو دنیای حەزی دەمیەوە و بەدوو پەنجەی تەڕ گۆپکەی مەمکەکەی تریانی ختوکە دەدا . چەند لێوەکانی برایم ڕۆحی زارای لە حەز هەڵدەکێشا ، موە زبرەکانی ڕیش وسمێڵی ختوکەی دەوری گۆپکەکانی دەدا و ئاگری لە حەزی سێکسی زارا بەردەدا ، دەمی خستە بنباخەڵی و لەگەڵ ماچەکانیا بۆنی لەش و بنباخەڵی زارای هەڵدەمژی، ڕۆحیان لە گڵپەیە ئاگری سێکس گیرا کوخەکەیان پڕ بوو لەهەناسەی ئۆف وگەرمی دەروونی چاوەڕوانی زارا .
ـ زارا تۆ گۆڵێکی بەهەشتیت و پەڕیویتە سەر زەوی ، بۆیە بۆنی لەش و بنباخەڵت هێندەخۆش و سێکساویە و دەروونی من شێت دەکا.
هێندە بەئاگراویەوە یەکتریان دەلستەوە لەیەکەم بەیەکەم گەیشتنی تنۆک و تەڕی حەزیاندا تۆوی کۆرپەیەکیان داڕشت ، مانگێکی نەبرد زارای سەلار و زرنگ مژدەی سک پڕ بوونی بەبرایم گەیاند.

برایم وزارا بە تەنیشت یەکەوە لەسەر گردۆلکەیەکی کوورِ دانیشتبوون و برایم دەستێکی لەملی زارا گرتبوو و زاراش بەسۆزەوە ملی لەسەر شانی برایم دانا ، بەجووتە چاویان بڕیبوە قولاّی زەردایییەکەی ئاسمان وجوانی سروشت، زارا هەرکاتێک ڕووی بکردایەتە خوا بۆ نوێژیکردن و پاڕانەوە ، چاوەکانی دەڕشت و قژەکانی بەسەر شان و ملیدا شۆڕی دەکردەوە ، چەند دوگمەیەکی کراسەکەی دەترازان ودرزی مەمکەکانی بۆ خوا دەردەخست ، دەیزانی خوا جوانی خۆش دەوێ و بەبینینیان شاد.

برایم دەستی بە سکە بەرزبووەکەی زاردا دەهانی .

ـ شیرینەکەم ئەمەش دیارییەکی گەورەی سروشتە .. حەقیقەتی سروشتە، ئەی سەرچاوەی هەمووبوونێ ، سوپاس بۆ ئەم دیاریەت بەهیوای ئەوەی ئەم کۆرپەیەو سمایل بتوانن دوای مردنم درێژە بە شۆرشەکەم بدەن تا ئەوکاتەی گشت مرۆڤایەتی دەگاتە ژیانێکی ئاسودە و تێر وبرایەتی کە ئەمانە گشتی ویستی هەموو مرۆڤێکی مرۆڤدۆستە .

برایم هەموو شەوێک سەری ئەسپایی دەکردە سەر سکە بەرزبووەکەی زارا و تا دەگەیشتە گەردنی ماچی سک و سنگ و مەمکی دەکرد، کات تێپەڕی و ڕۆژی لەدایکبوونی کۆرپەیە.. هەر شەوێ ژنانی هەورامی هاوسەفەر و هاوبیر و دراوسی لەزارا کۆ بوونەوە ، بەیانێکی شەبەقان بوو ، تەنیا ژنانی دەوری زارا و برایمی دێوانە نەبێ هۆزی برایمەیەکان لە خەوێکی ئارامدا بوون، دوای چەند زریکە و خۆگوشین وئارەقڕشتنێ ، زریکەی منداڵێک خێوەت وکوخ وبێدەنگی هۆزی شڵەقان، سلاّواتی پیرۆزی بەرز بۆوە (ئیسحاق) لەدایک بوو. (ئیسحاق و سمایل) بەری سێ جەستەی ئاوارەی هەورامی و جاف وهەڵگری پەیامێکی مژدە بەخشی مرۆڤن .

ساڵ و مانگ بەشێنەیی بەسەر چوو، ئیسحاق سەر پێ کەوتوو زمانی بەلایلایەی هەورامی و سکاڵای هۆرەی نامۆی جافی پژا ، گلێنەی

بینینی چاوەکانی بە جوانی دایکی و قۆزی بابی ڕۆا، مێشکی پاکی بەڕەوشت و کرداری دایک و بابی نووسرا ٠
زارا و برایم بەگڕوگاڵی (ئیسحاق) مەست دەبوون وبەردەوامی ژیان وپەیامەکەیانیان تیادەبینی .
ـ ئا زارا گیان ، ژنی جوانم، ئەمانە گشتی دیاری سروشتە و لەپاداشتی ئەو دڵە پاک و ئەو هەڵوێستە جوان و ئەو دەروونە ڕووناکەی تۆ وە هاتووە ، پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە سەردانێکی (هاجەر و سمایل )و مەڵبەندەکەی تر بکەم، دڵنیام هەڤاڵان چاوەڕوانن ، قوتابیەکان بێ وانەی نوێن، بێ ڕابەرن دەبێ بڕۆم وگوژمێکی تر بە شۆرشەکەی ئەوێ بدەم ٠
ـ برایم وا چەند هەفتەیەکە خورپەیەک دڵم دەگوشێ ، لەم سەفەرەت زۆر دەترسم ، سەفەرێکی ڕەش دەبینم نهێنیەک پێمدڵێ ، هەتا زووە ژمارەی ماچەکانت زۆر بکە ، هەتا دەتوانی بەشی ژیانت بۆنی سەرسنگ و ئەو ڕیش و سمێڵە پڕە هەڵمژە ، باوەشەکانت گەرم بکە ، دڵم خورپەی ترسێ جەڕاندوێتی، ئەو ووڵات و نیشتمانە ووشک و بێ ئاوە مرۆڤەکانی تورە وکەللە ڕەق وبێ بەزەیین ، دەزانم تۆ ناتوانی ئۆقرە بگریت و هەمیشە گڕی شۆرش لەناخدا گڵپە دەکات، سروشت تۆی بۆ ئەم ئەرکە دروستکردوە ، شۆرش ، گۆڕین ژیانتە ، دەڕۆی ئۆغر دەڕۆی ئۆغر ، برایم گیان هاجەر ماچ بکە سمایل بۆن بکە مژدەی بوونی برایەکی پێ بدە . وەلی ئاگات لەخۆت بێ ، نە کۆرپەکانت بێ ناز بکە نە ڕۆحی من و هاجەریش تینو .
دوای چەند ڕۆژێک کاروان ئامادەکرا و ، هەر ژنە ، هەر کێژە جلەوی ماتەمینی هوشترێکی بۆ پیاوەکەی ، دڵدارەکەی گرتووە ، غەمی جودایی ، کۆستی تەنیایی پەپکەی لەدڵیاندا خستووە ، لەوە دەچێ دوا چەپکە ماچێکی بۆ ڕێگەی دوور و درێژی بیابان باتێ ، بۆیە لێوی برایمی بەلێوەکانی کرۆشت٠
ـ ئاخ زارای بەڕێز وشاژنی کورد ، تۆ زۆر بەرزی دەیلێمەوە

سەرکەوتنی من بەمەزنی تۆوە بەندە ، تۆ هاوسەر و هاو خەبات و هاو ڕێگەم نەبوویتایە ئەم سەرکەوتنانەم بەدەست نەدەهانی تۆ نەبوویتا هەر صفاکەی هەورامان دەبووم نەک برایمی شۆڕشگێر .
دەستیان شل بوو لە یەک ترازان لە دەرگای کوخەکە هاتنە دەرێ و دوا ماچی ئیسحاقی کرد و سوار هوشترەکەی بوو. زارا ملوانکەیەکی سملّ ومێخەکی لەملدابوو دایکەن .
ـ ها برایم ئەم دیاریە بدە بە هاجەرخانم ، زۆر دەمێکە لە ئاوو هەواوکوردستان و بۆنی بەهەشتەکەی هەورامان و دوورە، زۆر دەمێکە بۆنێ مێخەک وسملّ گۆی ڕۆحی نمژیوە ، پێی بڵێ ئێمە سێ جەستەین و لە پێناوی بەختیاری و سەرفرازی مرۆڤدا خەبات دەکەین ، ئەم ملوانکەیەم بەڵگەی پەسەندکردنی هاوسەری برایمە ، هاوچارەنووسی و دایکی برای کوڕی منە .
چاوەکانی برایم تەقین و بوون بەمستێ فرمێسک و بەناو ڕیشە پڕەکەیدا ترازانە خوارەوە ، نەک لەبەر جودایی بەڵکو لەبەر بەرزی و خۆشەویستی و دڵفراوانی زارا.
ـ زارا تۆ ئەو کەسەی کە سروشت لەسەرت هاتە زمان . دڵنیام تۆ لە ڕۆحی سروشتەوە زۆر نزیکی . ئەم دڵ و دەروونە پاکەی تۆ نمونەی جوانی کاری جوانی سروشتە .
دوای چەند مانگێک بڕینی بیابانی وشک وبێ ئاو وماندووبوون بەدیداری هاجەری تەنیای شاد بوو هاجەرێکی برسی ، ماندوو ،لاواز ، سمایلێکی ترۆکراو و چڵکن، ماڵ کاولکراو، بێکەس لەکونجی خێوەتێکدا لەدەرەوەی شار توڕدرابوون ، قوتابییەکانی برایم هەریەکە لە کونجێکیدا حەشاردرابوون ، خێڵی قورەیش شارو قوتابخانە و پەرتووک ونووسراویان بەسەر یەکدا تێکدا بوو.
ـ ئەم چەتە کوردە چی دەکات لێرە ؟.
کاروانەکەی برایمیان ئەنفالکرد ، تالانیان کردن، پیاوانیان کوشت و ژنانیان بەتالانی برد ، نەیان هێشت برایم چەند شەوێک لەباخەڵی

هاجەردا ئازاری بیابانی لەجەستە دەربکات ماچێکی سۆزی سمایلی کوڕی بکات ، بەدیل گرتیان دەست وقاچ و چاویان بەست .
ــ تا ڕۆژێ زووتر ئەم شەیتانە کوردە بکوژرێ درەنگە .
بڕیار بڕیاری سەختی خێڵی قوڕەیش بوو، دەبێ هەر ئەمشەو بەزیندویی لە چاڵ بنرێ.
ــ چۆن دەبێ کوردێک خواکانی ئێمە بسوتێنی ؟ چۆن دەبێ ئافرەت فرۆشتن و گۆڕینەوەی بە هوشتر نەمێنێ؟ ئەمە کولتور و بازاڕی ئێمەیە ـ ئەمە یاسای ئێمەیە .
زۆر کەس هاواریان کرد برایم فریشتەیە و وای لێ مەکەن، شەرم مەکەن ئەو فێری خوێندن و چاکەو ڕاستی کردووین (ام یحسدون الناس علی ما اتهم الله من فضله اتینا ال ابراهیم الکتب والحکمه وتینهم ملکا عظیما ) لەشەوێکی عەجاجاوی ئەنگوستەچاودا ، چەند مەچەک ئەستورێکی شمشێر بەدەست هەر بەزیندویەتی برایمیان فڕیدایە ناو قوڵایی بیرێکی ووشک هەڵاتووی پڕ دووپشکەوە، فتوایاندا ئەو کەسەی دەیەوێ خوای لێ ڕازیبێ ، شەیتان لەو بیرەدایەو بچن بەردەبارانی کەن ، هەموو گاز و چزەی دووپشکێ هاوارێکی لە برایم هەڵدەسان و بەزمانی کوردی هاواری دەکرد .
ـ ئەو زمانە زمانی شەیتانەکانن بۆیە لێی تێناگەین، بەردی زیاتر بهاون با نووزەشی لێمان ببڕێ، ئەو بیرە شەیتانی تیدایە .
دەستە دەستە قوڕەیشیەکان دەهاتن و ئەرکی بتەکانیان ویاسای بازاڕی عکاظ یان جێبەجێ دەکرد، تا دەرچوونی دواهەناسەی برایم ئاهی بۆ بەهەشتەکەی هەورامان وجوانێکەی کوردستان داخی بۆ گەوجی کورد هەڵدەکێشا . ڕۆژ بەڕۆژ و ساڵ بەساڵ بەرد بارانی برایم نەبڕایەوە، بو بەکولتەرو یاسای قوڕەیشیەکا ئیسلامەکان تا ئێستاکەش هەموو ساڵێک بەردەکانی سەر ئێسکەکانی شان وملی برایم لە زیادبووندایە . هەموو موسوڵمانێک کە دەچێ بۆ حەج دەبێ ئەو تاوانە لەبرایمی ڕابەر بکات بە ناوی شەیتانەوە ڕەجمی بکات ،

ئەو حاجیانە نازانن لەو بیرەدا مامۆستای ڕابەرەکەیانی تیدایە ! .
چوو بوە ناوکارەساتی چیرۆکەکەو چاوەکانی نوقاندبوو، ووردە ووردە خـوی دەجـولاّن ، وەک ئەوەی چیـرۆکی برایم بەرەوکـۆتایی بچێ ئاو شەپۆلی ڕۆناکـیەکان بەرو کزی دەچوون ،دەبێ نهێنەکانی تەک خـوا نهێنی ڕاستـەقینە و پاک وبێ دەستکاری مـرۆڤ بن ، لەو ڕۆژەوەی پێی ووتراوە تۆ مـوسولّمانی پرسیـارە تاریکەکانی قوتداوە کەسێک نیــە وەلاّمــێکی بداتێ ، ناومــێــشک و دەروونی بە پرســیـــارە بێ وەلاّمەکـان قەبە ببوون ، کـەمێک ڕامـا...پرسیـاری لەخـوی دەکرد ، دەبێ نهێنیەکانی محەمەد یش لای خوا هەبێ ؟ مێژووی چۆن بێ ؟ پاک وبێگەردە وەک دایکم هەمـیشـە سلاّواتی لەڕووناکی ئەو دەدا ، یان ئەمــیش بەر ڕەخنەی خــوا دەکــەوی ؟ ئەی بۆ نا دەپرسم ، خــوا بەمیهرەبانی خۆی ئەم شانسەی پێ بەخشیوم ؟ پێش ئەوەی پرسیارە ئالۆسکاوەکانی ناومێشکی خاو بکاتەوە و بیان درکێنێ ، خوا هاتە وەلاّم .
ـ محەمدیش ئازارێکی زۆری ئافرەتانی داوە ئافرەتان لێیخۆش نابن خدیجەی چەوساندۆتەوە ، دەسـتـخـەڕۆی کـردووە تاپارەی نەداوەتێ سـێکسی لە تەکـدا نەکـردوە، تا هەژار بوو لای خـدیجـە بوو کــە دەولّەمـەند بوو بێ وەفـایی لێکردو کـۆمـەلێ ژنی بەسـەردا هانی، لە هەموو زەماوەندێکی نوێی محەمدا خدیجە ئازارێکی ڕۆحی چەشتوە هەر بەو ئازارەشەوە مرد. عائشـە تائێستـاش دەکرۆزێتەوە، ئازارەکانی شەوی زاوەیەتی لەجەستەو مێشکیا لە بیر ناچێتەوە تاوانی کردووە کە منداڵێکی (٩ ) سالاّنی مارەکردووە ، زینەب ژنی ئەو کویلەیە بوو کـردی بە کـوڕی خۆی، دوایی کـە زینەب شـەرابی سـێکس و باوەشی پیـاوی بینی جـوانیـەکـەی بالاّبوو لە چاوپێکەوتنێکا حـەزی لێکرد، کۆشکی بەختیاری ئەو ژن ومێردە گەنجەی ڕمان و بەتەلاّقدانی داو ، زینەبی بووکی مـارەکـرد، ئەمـانە و ئەو هەمـوو خـوێنەی بەناوی من و دادوەریەوە ڕشـتـووە سکالاّی ئەو هەمـوو بێـوەژنانەی دوای کـوشـتنی

مێردەکانیان جوانەکانی بەزۆر لەخۆ مارەکردوە و ناشیرینەکانی فرۆشتوە . لە نێوان ژنەکانیدا جیاوازی لەسەر ڕوویان ، لە ئاست تەمەنیان داناوە . کامیان جوان بووە ئاڵتونی زیاتری داوەتێ و زۆرترین کاتی بۆ تەرخانکردوون و سێکسی زیاتری لەتەکدا کردوون، ژنە بەتەمەنەکانی بەئازاری دەروونیەوە ئەشکەنجە داوە ، ئای چەند ناخۆشە ئافرەتێکی قەیرە دڵی بگوشرێ و دەروونی بسوتێنرێ ئەمانە گشتی لەگەڵ یاسای منی خوادا ناگونجێ، منی دەستخەڕوکردوە شەڕو شۆڕی بەناوی منەوە ناوەتەوەو مرۆڤەکانی تری ناعەرەبی چەوساندۆتەوە. من مرۆڤ وەک یەک دروست دەکەم . بەیەک چاو سەیری ڕەنگەکان . دەکەم ئەوانەی محەمد کردوێتی لەگەڵ ویستی منی خوادا ناگونجێ . محەمەد خۆیکرد بەنوێنەری من وکەسانێکی زۆر بڕوایان پێکرد . بەهۆیەوە ویستی عەرەبەکان لە ڕەوشتی پیس و کرداری بەربەریەت ڕزگار بکات . بۆ ئەو عەرەبانەی کچیان بەزیندویی لەچاڵ دەنا وبتیان دەپەرست وخەریکی دزی و تالانی بوون لە هەموو نەتەوەیەکدا ڕابەرێ هەیە ئەوانەی پێش محەمەد بوونیان هەبووە و وەک ئەو ڕابەربوون مرۆڤ بەئازادی لەدایک دەبێ و ئازادە چ ئایین وبڕوایەک هەڵدەبژێرێ . بەزۆری شمشیر و خوێن ڕشتن بڕوا هانین دروست نیە ، دەبێ مرۆڤەکان خۆیان ڕێگە و بڕوای هەڵگرن داگیرکردنی وولاتان و هەتیوکردنی منداڵان لە ڕێگەی خوادا دروست نیە، دژی ویستی منە ، من ئەو جۆرە موسوڵمانانەی بەشمشیر کراون بە موسوڵمان بە زوڵم لێکراو دادەنێم . دڵی زۆر ئێشانم کە هەڵگرانی دینەکانی پێش ئیسلامی بەکافر و فتوای کوشتنی دان، وولاتانی داگیرکرد و سامان وبژێوی میللەتانی تری زەوتکرد. ئەمانە لە یاسای منی خوادا نیە، سورەتی الانفال کە ڕەوایەتی بە دزی و تالانی دەدا قسە و ویستی من نیە. لەبەر خاتری بازاڕی قورەیش ودڵی بازرگانان دایناوە نەک من ودادوەری، من چۆن دزی وتالانی وهەڕاجکردنی ئافرەت حەلاڵدەکەم ؟ چۆن کوشتن و منداڵ هەتیوکردن ڕێگە دەدەم ؟

به ناوی دادوەری ئیسـلامـەوە ئەو هەمـوو خـوێنە برژێ ، بەهوی ئیسلامەوە دووژمنایەتی لە نێوان میللەتانی جیهاندا بکرێ؟. ئەمانە ویسـتی من و یاسـای من نەبوون بۆیە تائێسـتا ئەو پەتایە و ئەو نەگبەتیە یەخەی میللەتانی موسولمانی جیهان بەرنادا، منی خوا ئارامیم دەوێ ، ئاشتیم دەوێ، زەوی زۆرە، ئاو زۆرە نان و میوە زۆرە، کار زۆرە، بەلام ئێوەی مرۆڤ چاو چنۆکن، هەرکە دەسەلاتتان هەبێ هەولدەدەن بەشی ئەوی تر داگیر بکان و بێانچەوسێننەوە .
محەمەد ووتی شۆرش دەکەم دژی هەژاری و زولم و زۆر و لاقەکردن و زیندەبەچالکردنی ئافرەت ویاسای کەنیزەک و کۆیلە،هەرئەوەندەی دەسەلاتی فراوان بوو هیچ رێزێکی بۆ ئەو ووتانە دانەنا و لە هەموو شەرێکدا کە بەناوی منەوە دەیکرد تێدا بەهەزارەها ئافرەتی کەنیزەک دەکرد وپیاو کۆیلە ، ئەمانە ویستی من نەبوو من خوایەکی میهرەبانم ، دلسۆزم ،یاسای کەنیزەک وکۆیلە یاسای منی خوانیە .
ـ ئەی خوای گەورە و میهرەبان ، پێش کوچی محەمەد چەند جارێ بەدیداری بەرێزتان شاد بوو بۆچی ئەم گلەییانەت پێ نەگووت ؟
ـ تائێستا هیچ کەس بەدیداری من شاد نەبووە ، تەنیا تۆی زیندوو نەبێ هەرچی ئەوانەی ووتراون درۆیە ، زۆر لەو خەلیفە و مەلایانەی لە سەر زەوی خویان کردۆتە نوێنەری من ، درۆیان بەدەمی منەوە کردووە، لە ویستەکانی من لایان داوە من نەمکردوون بەنوێنەر. خویان بەزولم وزۆر بونەتە نۆێنەر، ئەوتاوانەی خەلیفەکانی عەباسی و ئەمەوی وصەفەوی و عوسمانیەکان بەرامبەر بە کەنیزەک و پاسەوان و پیاوانی دەرباریان کردویانە و کۆیلەکانیان خەساندووە لەو ئارەزوو و ویستەی من داومە بە پیاوان ئەوان لێیان سەندونەتەوە، یانی خەلیفەکان دژی یاسای منی خوا بوون ، ئەو هەموو کەنیزەکە ناسکانەیان لە وولاتانی ترەوە بەزۆر دەهانی و لەکۆشکەکانیاندا دەیان چەوساندنەوە لاقەیان کردوون ، کەی ئەمە ویستی منە ؟ کەی ئەمە لە رێگەی پەیامی مندایە؟ من ئافرەتم بۆ چەوسانەوە دروست

نەکردوە ئافرەت سەرچاوەی بەردەوامی مرۆڤە، ژیانە ، هەربۆیە کاتێ کەشتیەکەی نوح نووقم بوو تەنیا ( ٥ ) پیاو( ٦ ) ئافرەتم هێشتەوە چونکە سروشت و ژیان و مرۆڤایەتی پێویستی زۆری بە ئافرەت هەیە . جوانی ، خۆشی ، ڕێز ،دەروونی پاک وناسکم پێ بەخشیون ئەمانە هەمووی بەڵگەی نزیک بوونەوەو ڕێزی منە بۆ ئافرەت . بەڵام ئێوەی پیاوی دڕندە دەیانچەوسێننەوە، بێ ئافرەت ئۆقرەتان نیە کەچی ئەو جوانیەی من پێم داون ئێوە دەیشارنەوە، پەچە و عەبا دەدەن بە سەریاندا ، ئەمە دژی کردار و ویستی منە. یانی ئێوەی پیاو بە کردارو دروستکراوی من ڕازی نین ، من ئەگەر ویستم بوایە کە ئافرەت پەچە و عەبای بەسەرەوە بوایە ، دەمتوانی هەروەک چۆن بەبێ سمێڵ و ڕیش لە دایک دەبن ئاواش بەبێ قژ بوونایە قژی درێژ و جوانی ئافرەت هۆی بزواندنی ئارەزووی سێکسی پیاوە، من هەمووشتێ لە ئاستی ڕۆڵ و پێویستیەکدا لە مرۆڤ و سروشتا دروست دەکەم ! ئەمانە دڕندەی کرداری پیاون ، من بۆیە ئافرەتم بەو ناسکی و نازداریە دروستکردوە تارۆڵی لە دروستکردنی هەستی مەزنی مرۆڤایەتی و سێکس داهەبێ بڕوانن پیاو چۆن بەقژی درێژ و درزی مەمک وپوزی ناسک وبیستنی دەنگی ئافرەت حەزی ئاگر دەگرێت ؟ . ئافرەتیش بۆ دەنگ وڕەنگ وبۆنی پیاو هەروایە، ئەم دووهەستە بەرامبەر لە دووجەستەی دوومرۆڤدا بۆیەک درووستکراون، تا هەردوولایان ڕۆحی یەکتر تێر بکەن ، بژین ، بەختیاربن ، ژیان بەردەوام بکەن . ئەمانە ڕاستین تا پیاو بزانێ بێ ئافرەت ژیان بوونی نیە. سێکس یانی پرۆسێسی بەردەوامی ژیان . ئێوەی پیاو لەمەش تێناگەن بۆیە تاوانبارن بەرامبەر بە بەشێکی مرۆڤ ، محەمەد زویری کردم . لەبەر ئارەزووی خۆی و پیاوەکانی ، ئافرەتی کرد بە کاڵا ، بە ئاژەڵ، من زۆر دادوەرم ، دادوەرم بەرامبەر بەکردارەکانی مرۆڤ،ڕەش بێ سپی دەوڵەمەند بێ هەژار ئافرەت بێ یان پیاو !

ـ ئەی عیسا ؟

ـ تاوانبـاره بەوەی بۆ گـەورەی خـۆی و دەسـەڵاتـی ، منی کـردووە بە باوکی . یانی من دەست درێژیم لەمریەمی پاک کردوە، چۆن تورەنەبم؟ ئەمـە تاوانە لەمن و لە مـریەمی پاک دەکـرێ . ئێـوەی مـرۆڤ زۆر دەبەنگن چۆن خوا دژی یاساکانی خۆی و سروشت کار دەکات ؟ من ژن وپیاوم لەئاستێکدا دروستکردووە ئاستی یەکسانی و بێ جیاوازی بەبێ بەیەکگەیشـتنی ئەو دوو بوونە بەبێ تێکەڵاوی ئەو دوو ڕۆحـە بوون بوونی نیە ٠

ـ ئیتر چۆن عیسا بێ باوک لە دایک دەبێ ؟

ـ چۆن دەنکە جۆیە ، دەنکەگەنمێ ، گەنمە شامیەک بێ ئاو بێ خاک بێ خـۆر دروست دەبێ ؟ ئاواش ئافـرەت لە دەمـەوە بەهەوا سکی پڕ نابێ ؟ هەوا دەچێـتـە سـیـیـەوە نەک منداڵدان ، مـریەم مـرۆڤـە وەک هەمـوو ئافـرەتـەکانی تر من خۆم دروسـتکەری هەمـوو شـتـەکـانم ، من جادوو گەرو ساحیر نیم ، لەدەمەوە منداڵ دروست بکەم ، ئەمە دژی یاسای سروشت و منە ٠

ـ گەورەم خوای مهرەبان ، خۆ دەبێ عیسا باوکێکی هەبێ ؟

ـ چۆن نیـەتی، لالۆ کـوڕە جوتیـارێکی هەژاری کـوردە لەگەڵ مـریەم دا شەیدای یەک بوون . شەیدابوونێک تەنیـا منی خوا و خـۆیان وکـێوە بەرزەکـانی هەورامـان وبـاڵندە وڕووبـارو سـێـبـەری دارگـوێز و دەمی شیرینی هەنجیرەکان نەبێ کەس بەم چیرۆکەی نا زانێ٠

(وەک هەموو جارانی ژووانیان لەنا و کۆمەڵە دارگوێزێکی چڕی پشت دێ چاوەڕوانی مریەم بوو. سەرتاپای جەستەی کلـپەیەک ئاگری حەز وعەشق بوو . هەر لە دوورەوە قەدوباڵا باریکەکەی مریەمی بینی خۆی بۆ نەگـیـراو بەپرتاو بەرەو ڕووی خل بۆوە، باوەشـێکی گـەرمی بە باڵاخرپنەکەی مریەمداکردو سەری ماچ کردوو دەستی گرت و بەپرتاو بەرەو لـووتکەی کـێـوێکی بەرز بەهەنسکە برکێ بە بزنەڕێگای قـەد کێوەکەدا سەریدەخست٠

ـ لالۆ گیان بۆ کوێم دەبەیت ؟ چیت لەسەر ئەو کێوە بڵندە بنیات ناوە

؟ با پشــویەک بدەین توانام نەمــاوە ! بۆ کــوێم دەبەی ؟ بابچــینە حەشارگەکەی خۆمان و وەکی جاری جاران تا ئاسمان زەرد دەبێ پێکەوە بین ولێو وگۆی مەمکی یەکتری بمژن٠
ـ لالۆ ئەوەچیتە بۆ واپەلەتە ؟
لالۆ بەبێ دەنگی و هەنسکە بڕکێ دەسـتی مـریەمی بەرەو لوتکەی شاخەکە ڕادەکێشا
ـ ئارام بگرە مریەمی جوان ، تەنیا فرسەخێکمان ماوە دەگەینە خوا!
گەیشتنە سەر لوتکەی شاخەکەو لەسەر تەختە بەردێکی پان دانیشتن هەنسکە بڕکێکەیان ئارام بووە و باوەشیـان کرد بەیەکدا و لە جوانی سروشت و ڕوونی ئاسمان دەیانڕوانی٠
ـ مریەم سەیرکە سەرەتای بەهارێکی خۆشە . سەیرکە چۆن خۆر لێوی خونچەکان ماچ دەکات ، خونچەکانیش چۆن دەمیان بۆ ماچی خۆر کردۆتەوە ؟ وەرە شیرینەکەم باکلّپەی خۆری ئەم دلّە شەیدایە بە پەڕەی ڕوومەتی ناسکت و لێوی نەرمت دابمرکێنمەوە ٠
ـ شیرینەکەم مریەمی جوان ، ئەزانی ئیمرۆ جوانیەکەت لە تەک جوانی سروشت دا تێکەلاّو بووە، بۆیە واحەزی ماچەکانت هاری کردووم ؟ وەرە ئەو باوەشەی تەنیا تۆی گەرەکە !
باوەشیان بەیەکدا کرد، سەریان ئاسمانێکی شین وبنیان دۆلّی نێوان دوو کێوی کەلّەگەتی هەورامان ٠
ـ نەماچێک و نە هەزار گڕی ئەم حەز وعەشقەم دانامرکێنێتەوە ٠
ـ لالۆ ئیــمـڕۆ لێــوەکــانت وناودەمت بۆ ئەوەندە گـەرمن واخـەریکە ماچەکانت دەمسوتێنێ ؟
ـ مریەمەکەم من گەرەکمە ئیمڕۆ ژیانی خۆمت پێشکەش بکەم وتۆش خۆزگەکەم ٠
ـ خۆزگەی چی ؟ لالۆ گیان ئەوەچیتە ؟ ئیمڕۆ بۆ واتلێهاتوە ؟
مریەم سەری لالۆی خستە سەر شلکەی مەممکەکانی وبە پەنجەکانی سەری ختوکەدەداو دەیویست لە دلّە گزیی خۆشەویستی و گەرمی

دەروونی کەمێک ئارمبکات .
ـ لالۆ گیـان بۆ وا دەلەرزی ؟ قەد هێندەی ئیـمڕۆ زەلیلی مـاچەکـانم نەبوویت ؟ خۆ ئەمە یەکەم جار نیە ماچ دەکەین ؟ یەکەم جار نیە گۆپکەی مەمکەکانم دەمژی ؟
ـ مریەمی نازدارم نیوانمان کێوی پەیوەندی چەوتی کۆمەلایەتیە تۆ کچی بەگزادە( ئیمران ) و من کوڕە جوتیارێک ، شیرینەکەم مریەم چەند سـالّ وابژین ؟ من دەزانم ناتوانین بەئامـانجی ئەم دلّە گرگرتوەمان بگەین وەک ژن و مێرد ودایک وباوک خێوەتی سۆز بۆمندالّەکـانمـان هەلّبـدەین و پێکەوە بژین ، سـەرەداوی خۆشەویستیەکەمان لەگلّۆلّەی کۆمەلّە پەیوەندیەکی ئالّۆسکاوی کۆمەلایەتی چەوتدا گیری خواردووە ئاسان نیە لەو گلّۆلّە ئالّۆسکاوە خۆمان بقرتێنین ڕەگمان لە وکۆمەلّگایە بپچڕێنێن ۰
مریەیم گوێی لەم قسانە دەگرت و چاوەکانی پڕبوون لەئاوێکی پاکی عەشق ودلّداری۰
لالۆ سەری لەسەرسنگی مریەم بەرزکردەوە .
ـ ئاخ دەتۆمەگری هەناوەکەم ، کە ئەو چاوانەت بە فرمێسکەوە دەبینم دلّم ژان دەکـا ، مـریەم هەرچی لە پێناوی تودابیکەم پاداشـتی خواوەندی گەورەیە خوای گەوەرە تۆی بەو ناسک ونازداری وپاکی و میهرەبانیەوە هانیوەتە بەرهەم ومنیشی بەم دێوانەییە، ئەمانە هەمووی تاقیکردنەوەن و خواوەندلێمان دەکات ، بۆیە هەرچی لە پێناوی ئەم عـەشقـە پاکەدا بکەین ویسـتی خـواوەندە و جێبـەجێی دەکـەین، مرێمەکەم بەنیازی نزیک کەوتنەوە لەخوا و دورکەوتنەوە لە چاوی بزی شێتەکانی هۆزەکەمان هاتوینەتە ئێرە ئیتر توانام نەماوە وەرە پارچە دلّەکەم ، وەرە هەناسەکەم وەرە جوانترین دەستکردی خوا وەرە باوەشم باتێـر لە تەڕایی ناودەمت هەلّمـژم گـڕی عـەشـقی ئەم دەروونە دابمـرکـێنەرەوە ... نازانم ئێـمـڕۆ ووزەیەکی زۆر سـەرتاپای لەشی گرتووم، جاران هەر دلّم گڕیگرتبوو ئیمڕۆ ئێسکەکانی لەشم کلّپەی

حەزی تۆی لێهەڵدەسێ ئەمە یەکەمجارە وا گشت جەستەم ئاگر دەگرێ، دەکری خوا ئاگای لە دەروونمان بێ؟ دەمەگری ئەوەندەی ترلە زوخاو هەڵم مەکێشە وەرە ئەم باوەشەی کە تەنیا هەرتۆی گەرەکە .
لەباوەشی گرت و تێر بەسۆزەوە نوساندی بەخۆیەوە. مریەمیش چاوەگەشەکانی لێک ناو لێوە گوڵ ئاساکانی بۆکردەوەو ، تێر تەڕایی ناودەمی یەکتریان هەڵمژی و لە سەر پەڵە گیایەکی چڕ پاڵکەوتن و وەک دوو لقی لاولاو لەیەک ئالان.
ـ مریەمەکەم ژیانی خۆمت پێشکەش دەکەم .. تۆ خۆزگەکە!
ـ خۆزگەی چی ؟ لالۆ .... ؟
ـ تەنیا بۆ یەکجار با رۆحم تێکەڵاوی رۆحت بکەم و بەیەک بگەین !
ـ لالۆ ژیانم بۆ تۆ و لەشم بۆ خاک داناوە فەرموو لالۆی جوانم ئەوە لەش و ڕۆح و مەمک و ماچ و هەموو ژیانم قوربانی تۆیە .
سوخمە سورمەییەکەی داکەن ، دامێنی کراسە کوردییەکەی گرت و وورده وورده هەڵدایەوە ، دایکەن ولەبەردیدە وگڕی حەزی لالۆدا بە نیوەڕووتی وەستا .
لالۆ چۆکی دادیە سەر ئەژنوەکانی .
ـ ئای خوای گەورە ئەمە ئافرەتە یان پارچەیەکە لە جوانی تۆ ؟
هەردوولەپی دەستی بە نەرمایی کەمەر و پزووی دەرپێکەیدا خشاند و دەم و ڕیش وسمێڵ و لێوی لە پێستی ورگی دەخشاند وزمانی تەڕی شەهوەتاوی بە بەرزایی دەوری ناوکی و سەروی موسەڵانیدا هەڵدەسوو و ئاگری لەشەهوەتی مریەم بەرداو ، مریەمیش لەتاواندا باوەشی کرد بەسەرو قژیاو زیاتر بە بەرموسەڵانیەوە نووساند .
لەبازی ڕۆحا سوتابوون ، بۆیە پزوی دەرپێکەی مریەم ، لەبەرگڕی حەزی دەستەکانی لالۆدا ڕامالرا و مریەم ڕووت بووەوە، هەروەک ڕووتی ڕۆژی لەدایک بوونەکەی.
مریەم لەسەر پەڵە گیا چڕەکە بەپشتا کەوت ، لەشێکی باریکی پێست کاڵ ، جوتێ مەمکی خڕ ، ڕوویەکی جوان ، قژێکی درێژی

پەخشكراوی سەر گیاكە و شان وملی ، دووچاوی نەرم ودەم ولێوێكی تەڕی پڕ مـــاچ . باڵایەكی ڕاكـــشـــاوی ڕووت وتۆپەڵە مــــوویەكی ئاڵۆسكاوی بەر موسەڵانێكی ناسك . لالۆی شێتكرد و ڕۆح ولەشی بوون بەیەك پارچە پشكۆی سێكس . لالۆ هەروەك دەروونی گلاراوی پێكەوتبێ ئاوا بەخێرایی قەدی پشتێنەكەی یەكالاكردەوە و كراس وجۆغەكەی داكەن و ڕانك ودەرپێ خامەكەی بەیەكجار داماڵی و چوە نیـوان لاقەڕووتە بلاوكـراوەكـانی مـریەم و بەرزیكردنەوە. وورد وورد بەزمـان و ووردە مـاچ پاژنە خـرپنەكـانی ، پوزی ناسكی ، شلكەی ڕانی، نەرمی پشتی ئەژنۆی تا بەرموسەلانی مریەمی بەووردە ماچ وزمان تەڕكرد . ووزەیەك سەرتاپای لەشی مریەمی ڕاچڵەكان وبەهەر چوارپەلی باوەشـێكی حەزی بەكوڵی بە لەشی ڕووتی لالۆداكـردو، توووند بەخۆیەوە نوساند . لەناو باوەشی پەڵەگیاكەدا لەیەك ئالان. لالۆ بوو بە چەند دلۆپێ شەونمی حەزوو بەسەرگووڵە لەشەی ڕووتی مریەمدا توایەوە . شنەی شەماڵێ هات وگڕی جەستەی ڕووت وحەز و ماچ و باوەشیانی زیاتر گڕدا و تەكانەكانیانی ئاگراوی و بەسۆزتر كرد. گەرەكیان بوو لەناو یەكدابتوێنەوە ، ببن بەیەك لەش و یەك ڕۆح و یەك پارچە بوون . ئەندامەكانی لەشی یەكیان هەڵدەگلۆفت و ڕۆحیان بەیەك گـەیشت . بروسكەی حـەزێك زریكەی لە جـومگەكـانی هەردووكـیـان داو لالۆ بەسـەر لەشی مـریەمـدا توایەوە . ووردە ووردە هەناسەیان ئارام بۆوە و بەڕووتی بەپشتا كەوتن . تیشكی خۆرەكەش سەرتاپا لەشی ڕووتیـانی گرتبوو. مریەم سەری لەسەر قـۆڵی لالۆ دانابوو و بیری دوارۆژیانی وورد دەكردەوە .

دوا بەیـك گـەیشـتن و دوا دیدارە ، دوا مـاچە ، دوا باوەشـە ، دوا هەڵمژینی هەناسەیە ٠

ـ مریەمەكەم خوا بەو سەرەوە ئاگای لێ یە ئەم گڕە گڕی ویستی خوایە ، خوا منی شەیدای تۆكردوە هەرچی لە ڕێگەی تۆ و عەشقی پاكی تۆدا بیكەم زكری خوایە ٠

دڵی خـــورپەی ترســێک جــەڕاندبووی . ســـەری لەســـەر قـــۆڵی لالۆ بەرزکـردەوە وخـزانیە سـەر سنگە توکـاویەکـەی و زمان ولێـوی بەسـەر سنگی لالۆدا خشـاند . چاوەکـانی پڕ بوون لە ئاو وچەند تکەیەک لە فرمێسکەکانی ترازانە نێو توکە چڕەکانی سەرسنگی لالۆ، هەنسکی باڵا بوو، فرمێسکی بەخوڕ .

ـ مـریەم گیـان بەس بگری وەرە ئازیزەکـەم باتەڕاییی ئەوچاوانەت بمژم ئەوچاوانەی پڕن لە جوانی ، پاکی ، میـهرەبانی ، مرۆڤایەتی ، هەست حەز و هەمـوو شـتە جوانـەکانی دنیا . تـاوانە تەڕاییی ئەو چاوەجوانانە بڕژێنە سەر زەوی . تۆ نازانی ناخم تینووی هەموو شتەکانی تۆیە ؟ من دڵنیام کە من و تۆ لە خواوە زۆر نزیکین . ئەم هەموو ناسکی و پاکی و مـیـهـرەبانیـەی دڵ و دەروونە پاکـەی تۆ و ئەو هەمـوو عـەشق و گـڕە دەروونیەی منیش دیاری خوایە .

لالۆهەســتـاو سـەرێکی بۆ ئاسـمـان بەرزکـردەوە ، هەردوو دەسـتی بڵاو کردەوە .

ـ خـــوای گـــەورە ، من ســـەرپێـــچی ویســـتی تۆم نەکـــردووە و تۆ دروسـتکەری هەمـوو بوونێـکی دروسـتکەری جـوانی مـریەم و هەسـتی شەیدایی منی . دەسەڵاتم لەگەڵ کۆمەڵی دواکەتووی کوردا نیە . بە گەورەیی و مهرەبانیت دوای مردنی من مریەم بەختەوەرکە وا منیش دڵسۆزی و پاکی خۆمتان نیشان دەدەم.

ـ وەرە شیرینەکەم مریەمی پاک مریەمی جوان با بۆ دواکات ماچێکی خـونچـەی لێـوەکـانت بکەم . تێـر هەناسـە و بۆنی دەم ومێـخـەک و سملّی سەرسنگت هەڵمژم با دوا هەوای سیەکانم لەبۆنی سەرسنگ و هەناسـەت نەبڕێ بەڵێـن بێ هەناسە نادەم تا لەگـەڵ ئەو بۆنـەدا لەگـۆڕ بنرێم .

( دوامـاچی کـرد و چووە لەسـەر لووتـکەی شـاخـەکـەوە خـۆی فـڕێدایە خوارەوە لەنێوان دووچیای بڵندی هەوراماندا هەپرون بە هەپرون بوو، پەپولەی ڕوحیشی بەرەو بەهەشت هەڵفڕی ).

هەر لەبەر پاکی و پیرۆزی ئەو خوشەویستییەیە ، ئەو خوێنە ڕژاوە پاکەی لالۆ لەگەڵ گیان دەرچوونیا هەورەتریشقەیەک لە قولایی ئاسمانەوە هات و سنگی هەورێکی ئەستوری قاش کردو لێزمە بارانێکی بەتاو بەسەر لاشە و خوێنە ڕژاوەکەی لالۆدا ڕژا خوێنی جەستەی بەناخی زەویدا بردوو بوو بە ئاوی نێرگزە چاڵێ ، لەو ساتەوە هەموو ساڵێ لەسەرەتای بەهاردا نێوان ئەو دوو شاخە دەکەمە نێرگزە چاڵ و نێرگزی چاو گەش و بۆن خۆشتر لە نێرگزەکانی تری کوردستان دەگرێ . کوڕە عاشقەکانی هەورامان دێن و چەپکی لێدەچنن و پێشکەش بەدڵدارەکانیان دەکەن . هەر کچێ بۆنی ئەو نێرگزانە بکات شەیدای کوڕەکە دەبێ . بۆیە نێرگزی ئەو دۆڵە لە لای عاشقانی هەورامان ناوی نێرگزە چاڵی تەلیسماوی لێنراوە .

مریەم چوە سەر لوتکەی شاخەکە ولە لاشە هەپرون بە هەپرونەکەی لالۆی دەڕوانی . فرمێسک وئازار لە هەموو جەستەی مریەم دەتکا ئیتر جارێکی تر دڵدارەکەی نابینێتەوە باوەشی گەرمی لالۆ لەباوەشی ناگرێ . ئیتر جارێکی تر ماچ ناکرێت ، ختوکەی گۆپکەکانی سەرسنگی نادرێ!

ـ لالۆ گیان من دوای تۆ ژیانم بۆ چیە ، چیم بەسەر دێ ؟دەکوژرێم ؟ لووتم دەبڕەرێ ؟ دەبێ دوای تۆ لەسەر ئەم حەزەی تۆ چێم بەسەردێ ؟ پاشەڕۆژم لەگەڵ چ پیاویکدا دەبێ؟ لالۆ گیان؟ دەبێ وەک خوشکەکانم پیاوی هەڵبژاردەی براو باوکم هەبێ ، کێ دەتوانێ تامی ئەو ماچانەی تۆم پێ ببەخشێ ؟ . ئاخ تۆ پارچەیەک لە ڕەوشتی مرۆڤایەتی و پاکترین ئاوێنەی عەشق و دڵداری دنیا بویت ، بۆچی ئەمەت کرد ؟ من لە دوای تۆ ژیانم بۆچیە ؟ منیش دێم بۆلات و دەبم بە پارچەیەک لە لەشی هەپرون بەهەپرونی تۆ .

چاوەکانی نوقاندو چوە سەر لوتکەی شاخەکە ، لە ناکاو هێزێک لەئاسمانەوە چووە دەروونیەوە ، ڕایچڵەکان و لە (بڕیارەکەی پەشیمان بووە ) .

( نا من دەژیم بۆ یادگارەکانی تۆ ، لالۆی جوانم ، لالۆی شیرینم، دەبم بەدایک و خوشکانی هەموو دڵدارەکانی سەرزەوی . دەبم بە پێغمبەری خۆشەویستی و دڵداری . دەبم بە دێوانە ودەڕۆم پەیامی خۆشەویستی بە مرۆڤان دەگەیەنم . لە هەر شوێنی دڵدارێکی داماو هەبێ دەچم دەیلاوێنمەوە ، چاوەڕێ دەکەم خوای مەزن و میهرەبان بەری ئەم عەشقە پاکەمان نیشان بدا . دەبێ لە تۆ بچێ ، بۆنی تۆی لێ بێ ، ئەمە خۆزگەکەمان بوو نا ، نا من بەتەنیا نامرم ، مردنی من یانی مردنی خۆزگەکانی تۆی شەیدام ، لالۆ گیان تۆ ڕۆیشتی بەڵام تۆوی یادگارێکت لە ڕۆحما چاند بەڵێن بێ کەسێکی تر نەبێتە هاوژین و هاولەش وهاو هەناسەم ، چی بکەم ؟؟ دەڕۆم تا چاوی چەقۆی هۆزەکەمان ئەم دڵە گڕگرتووەم نەبڕێ .

ـدەڕۆم تا ئەو جێگەیی خوا پێی خۆش بێ .

ـ هەر ئەو ڕۆژە بە ناو شاخ وداخی سەختی هەوراماندا ملی ڕێگەی نادیاری گرت و سەری خۆی هەڵگرت. هێزم دایە بیرم دایە ، ڕێگەم دایە، شاخی بڕی شاری بڕی ڕووباری بڕی، گەرما و سەرمای بینی، برسێتی ، تینوێتی ، ماندووبوون ، هەمیشە فریشتەکانم وەک پەڵە هەورێکی سپی بەسەرسەریەوە بوون لە دڕندە لە گەرما لە سەرما لە پیاوە داوێن پیسەکان دەیان پاراست .

گەیشتە وڵاتێک ، نە زمانی زمانی ئەو بوو ، نە سروشتی سروشتی ئەوبوو ، نەکولتوری نە جلی نەئاو، نە خاکی نەخەڵکی .

چاوێکی گەش و قژێکی کاڵ و باڵایەکی باریک دەستێ جلی کوردی و چەپکە ملوانکەیەکی مێخەک و سملێ شەوێک خۆیکرد بەشارێکدا شار و چراکانی لە خەوێکی قوڵدا بوون . لەم کۆڵان و لەو کۆڵان وێڵی تروسکایی چاوی چرایەک بوو ، لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا لە پەنجەرەی قوخێکی پشت کۆماوەی ماڵە هەژارێکدا تروسکایی چرایەک ڕایکێشا .

(دەبێ ئەم ماڵە ماڵی شاعیرێکی شەیدابێ یان عاشقێکی دیوانە ؟

لەدەرگـای دا پیـرەژنێکی پرچ سـپی نوورانی دەرگـاکـەی لێکردەوە. پیـرەژنێک کـە هەمـیـشـە لە چاوەڕوانی هەواڵە خـۆشـەکـانی نیـوە شەودابوو سیمایەکی تینو برسی و ماندو نامۆ ) .
ـ کـچم وەرە شـەرم مـەکـە مـاڵی نەنکی خـۆتە ، چیت گـەرەکـە؟ لەوە دەچێ لە دەست زۆرداری وفـەلاقـەی مـێـرد یان لە زوڵمی بە زۆر بەشودان و فرۆشتن هەڵهاتبێتی ؟
لێی تێنەدەگەیشت، ئەم زمانی زمانی میللەتێکی ترە.
ـ ئەم لەش و لارە ناسکە . ئەم باڵاباریکە . ئەم قـژە خـورمـایی یە ، خـاوە ، ئەم چاوە نەرمـە گـەشـانە ، ئەم جل و بەرگـە والاَیانە ، ئەم ملوانکە بۆن خـۆشـانە ، ئەم هەمـوو جـوانیـە ، دەبێ بەرهەمی سروشتێکی جوان بێ .
ـ کـچم خـەفـەت مـەخۆ ، هەر کەسێک بیت ، هەر گـرفـتـێکت هەبێ مـاڵی نەنکی خـۆتە ، وەرەکـچم بەیانی چیـرۆکەکـەتم بۆ بگێـڕەڕەوە. شـەکـەت وبرسی وتینو هەر زووخـەوی لێکەوت . ڕۆژگـار کـردنی بە دووهاوڕێ ، بەدایـک وکچ ، بەنەنک و کـچـەزا، بوون بە دوو شـۆرشگێـر، بوون بە دوو یاخی ، یاخی لەزوڵم و زۆری پیـاوان و کـۆمـەڵ وکـولتـو . پاش مـاوەیەک زمـانی ئەویێ پژا بە زمـانێکی شکستەی نامۆ ، چیرۆکی یاخی بوون و سەرهەڵگرتن و حەز وماچ و دڵداری و خۆکوشتنی لالۆی بۆ گێڕایەوە .
ڕۆژ و شەوانیان خستە سەریەک و چیـرۆکیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە . یەکتریان خۆشویست خۆشەویستی دووجەستەی ماندوو، دوو ڕۆحی چەوساوە بەیەکگەیشتن.
ـ کـچم ئەمە زوڵم وزۆری کـۆمـەڵگایە، یاسای ئەم کـولتـورەیە پیـاوان ڕادەبوێرین وگڕی ئارەزووی شێتیان بەلەشمان دادەمرکێننەوە ، کەشخە بە سەرماندا دەکەن و هەر خۆشیان سک پڕبوونمان بەتاوان دادەنێن ؟ گـەر هەڵنەیەین و ڕەدوو نەکـەوین و درۆ نەکـەین چی بکەین ؟. درۆکـردن لەم جـۆرە دۆزانەدا چەکی بەرەنگاربوونەوە و یاخی بوونە،

یاخی بوون بەرامبەر بە زۆرداری ، بە یاساو نەریتی پیاوان ، کە لە پێناوی ئارەزووەکانیاندا دایان ڕشتووە . درۆکردنمان هۆی نەبوونی یاسای یەکسانی نێر و مێیە، هەڵوێستی یاخی بوونە لەپێناوی مانەوە و بووندا، لەپێناوی بەردەوامی ژیاندا. کچم مەگری ، هەر تۆ نیت نیوەی بەشەریەت ئافرەتە و بەدەست پیاوەوە دەچەوسێتەوە !

ـ دایە گەورە ، لالۆ پیاوێک بوو لەهەموو پیاوانی ئەم دنیایە جیا بوو! .

ـ کچم لالۆش قوربانی دەستی یاساکانی پیاوە ، یانی باوک وبراکەی تۆ بوو ، ئەی گوایە بۆ خۆی کوشت ؟ دەیزانی زۆرانی لەگەڵ کەس و کارتا بۆ ناگیرێ ، دیواری نێوان خێزانی ئێوەو خویانی پێ نارمێ !

ـ دەزانی لەم دنیا پان وبەرینەدا ، ڕۆژانە چەند ئافرەت دەکوژرێت ؟ چەند ئافرەت وەک مالآت دەفرۆشرێت ؟ لاقە دەکرێ ؟

ـ چەند ئافرەت لەسەر ووشەیەک لوتی دەبڕدرێ ؟

ـ لەسەر چی ؟ لەسەر سەرپێچی یاسای بەربەرێتی پیاو ٠

دایە گەورە دامێنی کراسەکەی هەڵدایەوە و لە سەر لایەکی سمتە چرچەکەی جێگەی پەڵە سووتاویەکی نیشاندا ٠

ـ دەزانی ئەمە چیە ؟؟

ـ نا دایە گەوەرە ! ئەوە چییە ؟ بۆ وات لێهاتووە ؟

دایە گەورە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو وەک گەرەکی بێ لە نوکەوە و بێ کەم وکوڕی چیرۆکی ئەم پەڵە سوتاویەی بۆ بگێڕێتەوە، خۆی ئامادەکردو دەنگی کەمێک بەکەساسیەوە نزمکردەوە و بەرگێکی غەماوی بەدەوری ووشەکانیا گێڕاو هەڵوێستەیەک وسەیرێکی مریەمی کرد کەچۆن چاوەڕێی چیرۆکی ئەم پەڵە سوتاویەیە ٠

ـ کچم مریەم بەیەکێ لەمنداڵەکانم سکم پڕ بوو ... ئاخ نازانم کامیان بوو ، لە مانگی خۆمدابووم و زۆرماندوی ئەرکی ماڵ و منداڵ و مالآت بووم هەر لەبەیانی زووەوە کە لەخەو هەڵدەسام ، من بەدەوری خۆمدا خولمدەخواردو هەڵدەسوڕام ، تا مالآتم ئاودەدا مناڵ زروقەی

برسێتی لێهەدەسا ، تا منداڵم ژێردەکردەوە نان و پێخەفم بۆ پیاو و میوانەکانی ئامادە دەکرد، ئەمانەو چەندەها ئەرکی تر . چاک لەیادمە زۆر برسی و ماندوو بووم وپێکانم زەویان نەدەگرت ، پیاوەکەم کەمنی بە چەند سەر هوشترلە باوکم کڕی بوو ، ئارەزووی سێکسی هەبوو ، پەلی گرتم ووەک هوشترێ بۆژوورەوە بەدوای خۆیدا ڕاکێشام ، پاڵێکی پێوەنام و بەسەرپشتا پاڵی خستم ، سوارسەرم بوو، وەک هەموو ژەمە زەهراویە سێکسەکانی ویستی سێکسم لەتەکدا بکات وەک برِایارم دابوو خۆم نەدا بەدەستەوە خۆم لە ژێریا ڕاپسکان دەرپەڕیم و ڕێگەم نەدا ، بۆ یەکەمجار لەژیانما لەویستی پیاو یاخی بووم (بەگێرانەوەی چیرۆکەکە ئازار پەڕیە جەرگی دایەگەورە و بۆ تاوێک بێدەنگ بوو )

مریەم وەک لەبەر چاوییدا ئافرەتێکی ڕووت وزەلیل لەژێر دەستی پیاوێکدا پاڵ کەوتبێ و چاوەڕێی داغکردن وچزەی سوتاندنی پێستەکەی بێ ، ئاوا بەئازارەوە چاوەکانی زەقکردبۆوە وچاوەڕێی چیرۆکەکەی دەکرد .

ـ ئێ دوایی ؟؟

ـ کچم چی لێکردم ؟!بە شەق وزللە هەر چوار پەلی لە گۆ خستم وبە سکی پڕەوە لە ژێر شەق وزللەکانیا ئیفلیج بووم . بەقژ بەژوورەکەدا ڕایکێشام لەناو ئازار جوڵەم لێبڕا بوو و هەر ئەوەندە زیندووبووم هەناسەم دەدا . وەک لاشەیەک لەبەر نەشتەری ئارەزووەکانیدا کەوتم بەچەقۆیەک کراسەکەی هەنج هەنچ کردم وبەندەخوێنی دەرپێکەی قرتانم . وەک دڕندەیەکی برسی سواری لەشم بوو، لاقەیکردم ، بەڵام چۆن لاقەکردنێ ! کە لێبۆوە ئەوزاڵمە نەیهێشت هەناسەیەک بدەم هەرلەشوێنی لاقەکردنەکەدا بەمقاشی ناو ئاگردانەکەمان داغیکردم. (دایە گەورە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا وچاوەکانی ئاوی تێزاو وکەمێک بێدەنگ بوو ) .

ـ ئەزانی بۆ ؟؟

ـ نا .. دایە گەورە بۆ !
ـ قیژاندی بەسەرمدا ووتی:
ـ بۆ ئەوەی جارێکی ترسەرپێچی ویستەکانم نەکەیت و هەرکاتێک خۆت شت ، هەرکاتێک چویتە سەرئاو ، هەرکاتێک خۆت گۆڕی ، چاوت بەم جێ داخە بکەویێت وترسی من ڕاتچلەکێنێ ، تۆ نازانی من خوای تۆم ؟ تۆ نازانی من تۆم کڕیوە بۆ دامرکاندنەوەی حەزەکانم بۆ کارەکەری ناو ماڵم ؟ چۆن سەر پێچی ویستی من و یاسای من دەکەی ؟.
مریەم لەئازاردا ملی نابوو بەلارەوە ، خوڕ خوڕ ئاو بەچاوەکاڵاکانیدا دەهاتە خوارەوە .
ـ دەتۆ مەگری کچم ، من هیچم نەگێڕاوەتەوە ، ئەمە تەنیامستێ فرمێسکە لەدەریای زوخاوی ژیانم .
لنگە فرتێی منداڵەکەی سکی ، مریمی ڕاچڵەکان ولەگوێگرتنی چیرۆکەکە پچڕاندی .
ـ ئەم لنگە فرتێیەت سەرەتایەکە بۆ زرنگیت ، دەبێ وەکی باوکی هوشیار بێ ، ئەی خوای گەورە چیم بەسەر دێ ، چارێک ، بەگەورەیی خۆت ڕەحمەتێ. ئاخ خوای گەوەرەچی بەخەڵکی بڵێم ...؟ بڵێم باوکی ئەم منداڵە کێە یە ؟ چێ بەسەر هات لە کوێیە ؟
دەستی دایە دەستە چرچەکانی دایە گەورەو بەلای خویدا ڕایکێشاو بەکوڕوزانەوە ، چاوی پڕ بەزیبیەوە ووتی :
ـ دایە گەورە ، تۆ بلّی دوای لالۆمنیش بکەومە دەست پیاوێکی وا دڕندە؟ دایە گەورە چیم لێدەکەیت ( دەستێکی بەسەر سکە بەرزبووەکەیدا هانی) .
ـ وابەڕێوەیە بۆ ژیان لنگە فرتیەتی
ـ کچم مەگری خوا گەورەیە ، تۆ ئازا وهوشیار بویت ئەم ڕێگەیەت هەڵبژار، ئەم دایکەی خۆت تائێستا سێ جار فرۆشراوم . سەد جار لاقەکراوم . تا پێستم چرچ نەبووبوو. تاگۆپکەکانی مەمکم قنج بوون

تا پوزەکانم ساف بوون ، تا گۆشتی لامل و سمتم خرپن بوو بازاڕم بوو بازاڕ ، بەرهەمەکەشی بۆ باوک و برام بوو .
بەمهرەبانیەوە سەری مریەمی لەباوەش گرت وبەدڵسۆزیەوە دەستی بەسەرو قژەخاوەکەیدا دەهانی :
ـ کچم مەگری ، ئەم دایە گەورەیەت سەری لەبەر هەتاو سپی نەکردووە ! ژیانم دۆزەخێک بوو بەدەست پیاوەوە ، هەزارها سەرگروشتە وکارەساتم بیستووەوە و بینیوە ، تۆ بلێی نەتوانم چارێکت بکەم ؟
(بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوون ) .
ـ کچم تۆ هەر لەئێستاوە کچە زامی .
مریەم سەری لەباوەشی دایە گەورە دەرهانی وچاوەکانی سڕی ، چەپکە پرسیارێکی سەرسامی بێدەنگی لێدەتکا .
ـ کچم مریەم ، هەرچەند نازانم چەند کچم فرۆشراوەو چەند کچەزام کوژراوە و لاقەکراوە ، کەس نازانی تۆ کێت ، هەربەیانی زوو لەم گەڕەکەدا دەیکەم بەقاو ، لەیەکێ لەشووەکانمدا لە وولاتێکی دوور و سروشتێکی نامۆدا ولە پیاوێکی جیا لەپیاوانی ئەم دەڤەرە ، کچێکم بوو ، ئەویش کچێکی بوو تۆ کچی کچەکەمی بۆ سەردان هاتویت بۆ ئەگرانە ولێرە خوا سکی پڕکردوویت .
هەر بەیانی زوو دایە گەورە لە ناو هۆزی عەرەبەکاندا کردی بەقاو و بانگهێژی ژنانی گەڕەکی کرد ، دایەگەورە چوار دەوری بە ژنە عەرەب گیرابوو. مریەمی قژکاڵ وچاونەرم و ئێسک باریک و کەڵەگەت والا پۆش ، وەک نقێمی مستیلەیەکی ئاڵتوونی دەست و پەنجەیەکی ڕەش لە ناو ژنانی عەرەبدا دەدرەوشایەوە .
ـ گوێ بگرن ژنانی خێڵی قەحتان ، شەوێک لە شەوان هەر وەک هەزاران شەوانی ڕابووردوو بەدیار یادگارەکانمەوە هەڵتووتابووم، لەناکاو لە نیوە شەودا، نیوە شەوێکی تاریک و تووندا، تیشکێکی بارێکی ڕەنگاو ڕەنگی جوان ، سەربانی ئەم کوخەی بڕی و کوخەکەمانی کرد بەچراخان .چراخانێک لە هەر قوژبنێکدا کۆنە

دەرزیەکی لێ کــەوتبــا بەو ڕووناکی و ئەو ڕەنگە دەدروشــایەوە .
مــریەمی کــچــەزام لە خــەوێکی نەرم و قــوولڵدابوو ، مــریەم بۆ ئەوەی دەمی بۆگــەن نەکــات کــە دەنووێ دەم داناخــات . هەرلەمندالّـیــەوە لەدایکییەوە فـێـر بوو ، دایکیـشی لە منەوە ! . ڕەنگەکـە باریک بۆوە باریک بووە وەک چەند تالّ دەزووی باریکی ڕەنگاو ڕەنـگ خــوی بە گەرووی مـریەمی کچەزامدا کـرد ، پاش تۆزی وەک ڕۆحیـان ختـوکە دابێ ئاوا مـریەم بەدەم خــەوەوە چەند زەردەخــەنەو ووردە ووڕێنەیەکی کرد. پاش مـاوەیەکی کورت مـریەمی کچەزام مـاتەمینی و بێـدەنگی دایگرتبووهەستی بەسک پڕبوون دەکرد شەرمی دەکرد نهێنی دلّیم بۆ بگێڕێتەوە . دەیزانی ئافرەت بێ پیاو سکی پڕنابێ . لەترسی ئەوەی تاوانێک نەخــرێتــە پالّـی دۆشــدامــاوبوو منیش لەتەک خــۆمــدا لەووردکــردنەوەی هونەری ئەو ڕەنگە باریکانەی ئەوشــەوەدا بووم تاووردە ووردە سکی بەرز بووەوە. چاری نەمــاو بەگــریان وترســەوە سکپڕبوونی خوی پێ ووتم ، وا دەیبینین سکی چۆن بەرز بۆتەوە ٠
دایە گـەورە جار جارە لە نیـوانی قسـەکـانیـا ، تیشکە تیلەیەکی لە چاوی مریەم دەکرد وبەچاو دلّنیای دەکرد چیرۆکەکەیان کاریگەری لە سـەر ژنانی عـەرەب داناوە . مـریەم بەدلّەوە گـوێی لە قـسـەکـانی دایە گـەوەر گـرتبـوو لە زۆربەی ووشـەکـانی تێنەدەگـەیشت وەلێ دەروونی پاکی هەردووکیان وەرگێڕێکی ڕاستی مەبەستەکان بوون دایە گەوەرە هێندە بەهونەریانە ئەم چیـرۆکـەی دەگـێـڕایەوە ، گـشت ژنانـی عـەربی خستبووە دنیایەکی تری جیا لەدونیای ڕاستی ، بۆیە چاویان زەق و دەمیان بۆ نهێنی ئەم چیرۆکە کردبۆوە ودەستیان یەکتریان دەگوشی و ترپەی دلّیان پەلەی دەکرد ٠
ـ دەزانن ئەو ڕووناکی یە ڕەنگاو ڕەنگە چی بوو ؟
ژنانی عەرەب هەموو بەیەک دەنگ ووتیان
ـ نا
ـ ئەوە ڕەنـگ وڕووناکی خـوا بوو ، مـعـجـزە بوو ، پیـشـانی مـرۆڤی دا

یانی ئەو منداڵەی لەمـــریەم دەبێ منداڵی خــوایە ، ئا.. ئا منداڵی خوایە ژنانی دەڤەر لێویان دەکرۆشت ، ترپەی دڵیان پەلەی دەکرد.
ـ دوای چەند ڕۆژێ مـریەم لە شـیـرینی خەو ڕاپەڕی وهاتە باوەشـمەوە ووتی :
ــ دایە گـەورە خەوێکی خۆشم دی ، خواهاتە خەوم ، مـژدەی پێدام و ووتی منداڵێکت پێدەبەخشم ، منداڵێک لە هەموو منداڵانی ئەم دنیا یە جـوانتـر و زیرەکتـر و زاناتر وهوشـیـارتر بێ ، مژدەی بەختـیـاری و ئاسودەیی و دادپەرووەری بۆ مرۆڤی پێبێ !
دایە گـەورە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم چیـرۆکـەی بۆ دەر و دراوسێ بڵاودەکـردەوە ئەوانیش بۆ هاوڕێ و کەس و کـاریان، لەشاردا بووبە قاو منداڵی خوا بەڕێوەیە و رەحـمـەت بۆئەم شـارە دێنێ . برسـێـتی ، زوڵـم و زۆر دزی کـوشتـن و فرۆشتنی ئافرەت نامێنی ، یانی ئاسایش دەبێ ، ئاسایش
.
مـریەم بوو بە پیـرۆزترین ئافـرەتی ئەو شـار و ناوچەیە .چەپک چەپک ژنان دەهاتن بۆ دیدەنی مریەم . مریەم نیشانەی هاوسەری خوای پێوە دیارە . نـاسکـی و مـیـهـرەبانی وکـەم دوویی گـریانی زۆری و کـەم خـۆراکـی . مـریەم لەدڵـەوە بۆ لالۆی دڵداری و بـاوکی کـۆرپەکـەی ، بۆ نیشـتـمان و خوشک و دایکی وپاشەڕۆژی و دەربەدەری دەگریاو ژنانی عــەرەب بەزکــری خــوادایان دەنا . چاویان بڕیبــوە فــرمــێــسکی چاوەکاڵەکانی و هەنسکەکانی دڵی گەرمی.
ـ ئەم هەموو گریانە زکری خوایە .
ـ ئا وایە .
ـ لە دڵەوە قسە لەگەڵ خوادا دەکا .
ـ بە ڵێ وایە ... هەر بۆ یە وابێ دەنگ و کەم دووە .
نەک دایە گەورە و ژنانی گـەڕەک ، شـارێک چاوەڕێی لەدایـک بوونی منداڵی خوابوون .
ـ دەبێ منداڵی خوا چۆن منداڵێک بێ ؟

ـ چاوەکانی چۆن بن ؟
ــ بالاّ و بالّەکانی ؟؟
ــ قژی ؟ پێستی ؟؟؟
هەمووگەورە کچانی هۆزی عەرەب ئاواتە خوازبوون شەوێک خواخۆی بکات بەمالّیانداو سکیان پڕکات ، کە دەنووست خۆیان دەشتن دەمیان دەکردەوە وپەنجەرە و دەرگایان والاّ دەکردمالّیان خاوێن دەکرد .
خۆراک وئاوی مالّی دایە گەورە بووبوو بە موفەڕک وگەورە کچان و بێوەژنانی قەیرە سەرەیان بۆگرتبوو .
نۆ مانگ بەسەر بەیەکگەیشتنی لالۆ ومریم و سەرهەلّگرتنیا تێپەڕیبوو . ڕۆژ ڕۆژی ژان وئازارو کاتی لەدایک بوونە !
مریم چوار دەوری بەژنە عەرەب گیرابوو. هەرپەلێکی بە دەست چەند ژنێکەوە بوو. چاوە ڕەشەکانیان کێبەرکێی بینینی یەکەم مندالّی خوا بوون.
دایە گەورە لە نێوان ڕانە خرپنە پێست کالّەکانی مریەمدا هەلّتووتابوو و چاوەکانی بڕیبوە قولاّییەکەو چاوەڕێی زروقەی مندالّێکی دەکرد .
ئازارێک ناوسکی مریمی ڕاکێشاو لە تاواندا لێوەکانی کرۆشت .
ـ ئای دایە گەورە ناوسکم پچڕا !
ـ کچم ئارام بگرە و بەهێزبە ئەم دایە گەورەیەت چەندەهاجار بەسەر مندالّەوە مردووە و زیندوو بۆتەوە چەندەها جار بەتەنیا و لە پالّ هوشترێکدا لە بیابانێکدا مندالّم بووە کچم بەغیرەت و بە تەکانێ، هەر تەنیاسەری مندالّ زەحمەتە لەش باریک ونەرموو شلە .
بەسۆزەوە دەستی بەپوز وڕانە ناسکەکانیادەهانی
ـ کچم خەفەت مەخۆ ، تا ئەم دایە گەورەیە مابێ تەنیا نابێ ، دوایش خواگەورەیە .
مریەم بە دەم ئازارەوە چاوی بڕیبووە ڕووناکی تەنیاپەنجەرەی کوخەکە. هەستی بەتەنیایی و بێنازیەکی سوتێنەردەکرد چەند ستەمە

بێ دایک وخوشک و دڵسۆزان ئافرەت لە غوربەتدا منداڵی ببێ ، وێنەی خوی ودایک وخوشکان وژنانی دێکەیانی هانیەوە یاد کەچۆن لە کاتی منداڵبوونا بەدەوری خوشکەکیدا هەڵدەسوڕان ) .
( ماڵ پڕبووبوو لە ژنانی دێ هەریەکە خەریکی شتێ ، باسوقی نەرم و کەشکی خوساو ، گوێزو مێوژی تەڕ وشیلاوی ، لە پشت سەری خوشکیا ڕیزکرابوو ، باوکی کۆرپەی چاوەڕوان ، لە شاخەکانی هەورامان ویلّی ڕاوکردنی ئاسکێکی خرپنە و بۆ شەوی لەدایک بوونی کۆرپەکەی دەکرێ بەکەباب هاکا هاتۆزێکی تر خوشکەزاکەم بەرێوەیە بۆ دنیای ئەم دێیە ، بۆ بەهەشتی هەورامان .
مریمی کچە بچوکی ماڵ لە کاتی منداڵبوونی خوشکەکەیدا ئەرکی چاوەڕوانی کاری سەرپێ یی پێسپێردرا بوو . لەگەڵ ئازارو پێچی ژانەکانی خوشکیا لوولدرابوو .
ـ تۆ بڵێت ڕۆژێک بێ و منیش منداڵم بێ.... ؟
دایکی لە نێوان ڕانەکانی خوشکیا بە چاوەڕوانیەکی سەختەوە هەڵتروشکابوو. ترسی لە دایک بوونی کچێک دڵی جەڕاندبوو .
ـ کچم غیرەتێ یەکەم منداڵ سەختە ، خوا بکات ئەم ژانە سەختە ژانی کوڕێک بێ .
لەگەڵ هاواری خوشکی و زروقەی منداڵێ ، دایکی لەخۆشیا ڕووی سوور هەڵگەڕا و چاوەکانی گەش بوونەوە . دڵە خورپەکەی وجەڕاندە دەروونیەکەی ساریژ بوون .
ـ کچم کوڕێکت بوو . سوپاس بۆ خوا کوڕێکت بوو !! ئادەی هەواڵ بەرن بۆ دیوەخان .
ـ ئێستا پیاوەکەت بزانێ شاگەشەدەبێ ! کچم کوڕت بووە ، ڕێزت زۆربوو ، خۆشەویسیت بالا بوو ، کوڕت بوو ، کچم کوڕت بوو .
هێشتا ناوکی نەبڕی بوو بەخوێنەکەوە چەند جاری ماچیکردو نووساندی بەخویەوە.
ـ تۆ کلیلی بەختیاری کچەکەمی ، سوپاس بۆ تۆ خوایە وا نۆ مانگە

من له دڵه خروپەی هاتنی ئەم کوڕەم ، سوپاس بۆ تۆ خوایه گیان ٠
ـ ئۆخەی کچه شیرینەکەم کوڕت بوو کوڕت بوو !! )
مریەم دەگریا و یادگارەکانی دڵی دەسوتان ٠
چاوی بەناو ژنانی سەرتاپاڕەشی عەرەبدا گێڕا ، هیچ ڕوویەکیان له ڕووی خوشک ودایک و ژنانی دێکەیان ناچێ . لەتاو ئازاری سکی هاواری دایکی بەکوردی دەکرد . دایه گەوره نەبی کەسێک لەژنانی عەرەب نەیان دەزانی ئەم هاواره بەچ زمانێک دەکرێ٠ مقۆ مقۆ لەناو ژنانی عەرەبدا پەیدا بوو ژنێ ووتی :
ـ ئەم زمانه دەبێ زمانی خوا و پێغەمبەران بێ ٠ بۆیه ئێمه لێی تیناگەین ٠
یەکی لەژنەکان ووتی
ـ بەڵی وایه به خوا سەد جار وایه ٠
( ئەی دایه گیان... تۆ له کوێت ؟ دایه مهرەبانه دڵسۆزەکەم ئاخ لالۆی جوانم دەبێ ڕۆحت لێره بێ و من ببینێ پێدەکەنی ، دڵخۆشی ؟ وا بەرهەمی عەشقەکەمان بۆ ژیان بەڕێوەیه ، خۆزگه هەر لەتۆ دەچوو تا لەجیاتی تۆ ڕۆحی تینوم ئارام بکات ) ٠
ئازارێک ناوجەرگی بڕی .. هاوارێکی تیژی کرد :
ـ کچم ئارام بگره واسەری هات ، ئازابه تەکانێ ، ئادەی غیرەتێ٠
( لالۆی جوانم دەزانم ڕۆحت له کونجێکی ئەم کوخەدایه ، توو پاکێکەت توو جوانیەکەت لالۆ ، تەنیایەک زەردەخەنه ، باچاوەڕەش وسەروریشه نەتاشراوەکەت ئەو سمێڵەی سەدەهاجار بەم لێوانه بۆم داهانیویت ئای کەجوان بوویت تووجوانیەکەت بۆ یەک سات خۆت دەربخه. دەزانم ڕۆحت لێرەیەو دەمبینی ، هیچم ناوێ تەنیا یەک ووشەم لەتەکدا بڵی و زیاترناناوی بنیم چی ؟ شازاد ، نەوزاد ، عاشقزاد ؟ ناوی دەنێم خۆزگه ، ئا خۆزگه چونکه بەری خۆزگەمان بوو٠
ئازارێ ناو لەشی مریەمی بڕی و دەنگی زروقەی منداڵێ هەناوی

چاوەڕوانی ژنانی ناو کوخەکەی ڕاچڵەکان . سلاواتیان داو دەستیان بەسنگەوە گرت وملیان بۆ کۆرپەی خوا شۆڕکرد٠ هەر لە یەکەم ساتەوە پیرۆزییان کرد٠ کۆرپەیەکی پێست کاڵ وقژ ئاڵۆسکاو، دووچاوی گەش ، برژانگی درێژ ، لەشێکی ڕێک وخرپن.
ـ سەیرکەن چەند منداڵێکی ناسکە !
ـ پێستی کاڵی !
ـ قژی زەردی ! چاوی گەشی . ڕاستە ! ڕاستە کوڕی خوایە!
ـ بە خوا کوڕی خوایە !٠
ـ ڕاستە کوڕی خوایە بۆیە وەک منداڵەکانی ئێمە ئەسمەر نیە !٠
کۆرپەکەیان بە پارچە پەڕۆیەک پێچایەوە و خستیانە سەر مەمکە پڕشیرەکانی مریەم . دایە گەورە وەک چگەرکۆشەی خوی بەدڵسۆزی ومهرەبانیەوە ئارەقەکانی ناچەوانی مریەمی دەسڕی و دڵخۆشی دەدایەوە ٠وورده وورده ژنان کوخیان بەجێ هێشت ، مریەم و دایە گەورە وەک دایک وکچ بەتەنیشت یەکەوەدانیشتبوون و سەیری چاوە تازە هەڵهاتووەکانی مناڵەکەیان دەکرد کە چۆن بەحەزەوە گۆپکە قاوەیی یەکیانی مەمکی دایکی دەمژی . مریەمی دایکیش هەستی بە خۆشەویستیەکی مەزنی دایکایەتی دەکرد و دەستی بە مووەکاڵەکانی سەریدا دەهانی و بەدوای وێنەی ڕووی لالۆی شەیدایدادەگەڕا ٠
ـ چ شوێنێکی لە باوکی بچێ ؟
ـ کچم ڕووی منداڵ زوو دەگۆڕێ پەلەمەکە !
ـ کچم مریەم ناوی بنێن چێ ؟
بێ بیرکردنەوە مریەم خیرا ووتی :
ـ خۆزگە
ـ چی.... ؟
ـ کچم خۆزگە ناوێکی کوردیەو بەم دەڤەرە نامۆیە کەس لێی تێناگات و چیرۆکەکەشمان کاڵدەبێتەوە ، خو ئەگەر بزانن کوردی ! دوور نیە شار بەدەرت نەکەن ، خۆت و کۆرپەکەت لە بازاڕی کۆیلەکاندا هەڕاج

نەکەن ! .
مریەم دەستێکی بەسەری کۆرپەکیدا هانی و فرمیسکەکانی سڕی. وەک لە کێۆبێکی سەخت و ماندووکەر هاتبێتەوە ، هەناسەیەکی هەڵکێشاو سەیرێکی دایە گەورەی کرد ووتی:
ــ دایە گەورە ، ئەم کۆرپەیە بەری خۆزگە و دڵداری من و لالۆیە. بەڵێنم دابوو خۆزگە و هیواکەی بهێنمە دی ٠ بڕوابکە دایەگەورە هەر لەبەر ئەم کۆرپەیەو هیواکەی دوای کوشتنی لالۆخۆم نەکوشت!
ـ ئاخر کچم کەس تێناگا !
ـ دایە گەورە بەعەرەبی بە خۆزگە دەڵێن چی ؟؟
ـ خۆزگە یانی ( عسی ) دەبا ناوی ( عسی ) بێ هەر خۆزگە بێ گرنگ نیە چ زمانێ بێ ٠
لەگەڵ گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە رۆمانسیە بە دەنگی ناسک و پڕمۆسیقای خوا ئەم ببوو بە بینەرێکی ڕاستەقینەی بەسەرهاتەکانی ناوچیرۆکەکە و بەخەیاڵ لەکونجێکی کوخەکەی دایەگەورەدا هەڵتووتابوو. ئاواتە خوازی دڵداریەکی لەم چەشنە و ئافرەتێکی ناسک و نازدارو بەعەشقی وەک مریەمی دەخواست ٠
ـ ئائەمەڕاستی ئەو چیرۆکەیە کە ئێوەی مرۆڤ ناوێرن بیدرکێنن . من ویستم پاداشتی ئەو خوشەویستیەی مریەم بدەمەوە ومنداڵێکی هوشیارم پێ بەخشی کەچی ئەو منی لکاوی کردوە ، تائێستاچیرۆکی ئەو پیرێژنە بۆتە بڕوای میلۆنان مرۆڤ ٠
بەگوێگرتن و گفتوگۆکردن لەگەڵ خودادا زۆر دڵخۆش و بەدەنگی پڕسازی گەشەی دەکرد . گەوەریی و ڕێز ومهرەبانی خوا لە دڵ و دەرونیا فرەتر دەبوو و زاتی پرسیارەکانی مێشکی جولا . پرسیارێکی لەمێشکیا دارشت و دوو دڵ بوو لەدرکاندنی چیرۆکی ئادەم وحەواو توڕەبوونی خوا ٠
ـ گەورەم ئەی خوای گەروەو مهرەبان ئەی ئادەم و حەوا بۆچی شەیتانت بۆ ناردن ؟ سێوت بۆ دروستکردون؟

هەڵوێستەیەکی کرد نا .
( نایکەم ، نایکەم نەکا خوای مەزن و مهرەبان زویر ببێ ) لەکوتایی بیرکردنەوەکەیدابوو دەنگی شەپۆلە ڕەنگاوڕەنگەکان بەرز بووە ووتی :
ـ مەترسە وچیت لەدڵدایە بیڵێ ، من مرۆڤم بەئازادی دروستکردوە مرۆڤی ئازادی خوازو ئازام خۆش دەوێ . ئەو مرۆڤە یاخیانەی لەچەوتایەتیەکان یاخی دەبن و لە ڕاستیەکان بێدەنگ نابن لە منەوە نزیکن و خۆشەویستی منن . منی خوا ئازادی لە هیچ مرۆڤێک زەوت ناکەم بۆیە ئەوانەی لەپێناوی ئازادی نیشتمان ویەکسانی مرۆڤ و نەمانی چەوسانەوەدا شۆڕش دەکەن و ژیانیان دەکەن بەقوربانی نەتەوە و نیشتمان وئازادیان ، ئەو کەسانەلای منی خوا بەڕێزن وجێگەیان بەهەشتە . من لە ئادەم و حەوا زویر نەبووم ئەو دووانە خوشەویستی منن . من کە مرۆڤ دروست دەکەم هەموو توانا و ئارەزوەکانیشی پێدەبەخشم . توانای سیکس یەکێک لەو دیاریانەی منە بۆ مرۆڤ ، دیاریەک لەپێناوی بەختیاری و ئارامی ڕۆحی مرۆڤ و مانەوەی مرۆڤایەتی . سێکس بازیی ڕۆح و جەستەیە و رۆح پێ ئارام دەبێ ، خواردن ووزە دەدا بە لەش . سێکس بەڕوح ، گەر ڕۆح برسی بوو لەش ئیفلیج دەبێ و مرۆڤ شێت . بۆ منی خوا جیاوازیەک لەنیوان برسی بوونی ڕوح و برسی بوونی گەدەدا نیە ؟ . بۆیە هەر مرۆڤێک مرۆڤێکی تر لە سێکس برسی بکات ، لای منی خوا وەک برسیکردنی مرۆڤ وایە لە خواردن . ئاخر چ شتێک لەسێکس پیرۆزترە ؟ . گەر سێکس نەبێ مرۆڤ دەبێ زیندەوەران ماسی هوشتر، مەڕ بزن ، دەبن ؟ هەڵاڵەی گوڵێ گوڵێ ماچ نەکات گەشەناکات، ئای ئێوەی مرۆڤ کەزاڵمن ، بۆچی هێندە خۆش بڕوان ، هەرچی ڕیشی هەبوو زانانیە ؟ هەرچی ووتی من نۆینەری خوام جێی بڕوانیە ، بڕوا بەخوا بڕوا بەڕاستیە و ڕاستی لە بەرچاوە ، ڕاستی لەبووندایە، لە بوونی خودی مرۆڤدایە ، لەسروشتدایە ، سێکسی بەدڵ و بەهەست وەک نوێژ وایە !! وەک نوێژ وایە ، هەر هەمووی پەیوەندی بە ئارەزوو

و پێویستیەکانی مرۆڤەوە هەیە . جوانترین دیمەن لای منی خوا شەوی زاوایەتی دوو عاشقەو ژووان و بەیەکگەیشتنی دوودڵدارە ، وەک بەیەکگەیشتنەکەی مریەم و لالۆ ، ناشیرنترین دیمەن و تاوانترین تاوان بە زۆر سێکسکردنە ، لاقەکردن و لێدان و کڕینی لەشی ئافرەتە. ئادەم و حەوا سێکسیان کرد کارێکی چاک و ویستی منیان هێنایە دی مرۆڤایەتیان دروستکرد ، بۆیە چارەنووسیان بەهەشتە و خوشەویستی منن . شەیتان بوونی نیە ، مرۆڤە دڕندەکانی سەرزەوی شەیتانن ئاخرمرۆڤ گەرهوشیاربێ دەزانێ من سەرچاوەی هەموو خۆشی و بەختەوەریەکم ، گەرمن شەیتانم دروستکردبێ کەواتە من تاوانبارم بەرامبەر بەتاوانەکانی شەیتان . چۆن من شەیتان دروست دەکەم بۆ ئەوەی مرۆڤ تووشی خراپە بکات ؟ ئێوەی مرۆڤ بۆ ئەوەندە خۆش بڕوا و دەبەنگن . بەمەش منتان لەکاوی کردوە و یانی من سەرچاوەی خراپەم . پێغەمبەر و پیاوانی ئاینی کاتێک لەئاستی پرسیارێکدا گیریان خواردووە ، تاوانەکەیان خستۆتە پاڵ هێزێکی خراپەی خەیاڵ شەیتان ! ، ئەوان دروستکەری شەیتانن . من نە شەیتانم دروستکردوە نە سێکسم حەرامکردوە ، گەر سێکس لای من حەرام بوایە ، توانای سێکسم لەلەشی مرۆڤدا دروست نەدەکرد ؟ . سێکس بەشێوەیەک کە هەردوو ڕۆح و جەستە دروستکەری بێ ، یانی (ڕۆحی ئافرەت و پیاو ) جێبەجێکردنی ویستەکانی منە ، هەر کەسێکیش ویستی منی خوا جێبەجێبکات ، جێگەی بەهەشتە . ئێوەی مرۆڤ مێشکتان بەکار ناهێنن ، پرسیارەکان دەخۆنەوە و دەترسن . ئەو مرۆڤەی ویستەکانی خۆی بخنکێنێ یانی ویستی منی خنکاندوە . هەموو مرۆڤێک خوای خۆی و ئارەزووەکانی خۆیەتی ، منیش خوای هەموو مرۆڤێکم و بۆیە خواکانی سەرزەوی ، دەبێ ویستەکانی خوای هەمووان کە منم ، جێبەجێبکەن . ئەوەی دەست بخاتە بینی ئارەزووەکانی خۆیەوە، یانی بەویستەکانی من ڕازی نیە و سەرپێچی ویستەکانی من دەکا ، ئەو کەسانە جێگەیان دۆزەخە .

ـ ئەی خـوای گـەورە ، ئەی بۆچی لەمـحـەمـەد زویربووی کـە دەزانی کۆمەڵە ژنێکی زۆری هێناوە ولەگەڵ هەموشیانا سێکسی کردووە ئایا ئەمە جێبەجێکردنی ویستەکانی تۆی مەزن نیەلەلایەن محەمەدەوە ؟؟ ئەی بۆ ؟

ـ یاسـای من یاسـایەکی مـرۆڤـایەتیـە ، یەکـسـانیـە، دەبێ هەمـوو مرۆڤەکان یەکسان بن . نانیان هەبێ ، کاریان هەبێ ، ماڵیان هەبێ محەمەد بەهانینی ئەو هەموو ژنە سەرپێچی یاساکانی منی کردووە یاساکانی من ، یەک پیاو مافی ئافرەتی هەیە و یەک ئافرەت مافی یەک پیاوی هەیە . هیچیان مافیان لەویتر زیاتر نیە ، هەردوو هەر مـرۆڤن . جگە لەمـە زۆربەی زۆری ژنەکـانی بەزۆری شـمـشـێـر و هەڕەشەی کافر بوون و سوتاندن و هەڵواسین هانیوە ژنە تالانی بوون ژنە ئەنفال بوون مێرد وبراو باوک و دایک کوژراوبوون بەناچاری و لەبرسا ولەترسا سێکسیان کردووە سێکسەکانیان لەڕۆحەوە نەبوە ئەمانە پەسەند ناکەم . بەم جۆرە وبەم یاسایە ئافرەت لە مرۆڤەوە کرا بە ئاژەڵ وپلەی مرۆڤایەتیان هاتە خوارەوە ، وەک هوشتر ، بزن و مەڕ ومـالات هەر کـەسـێک پارەو دەسـەلاتی هەبێ چەند ژنی گـەرەکـە ودەتوانی هەیبێ ، ئەمە ڕاست نیە ، دژی یاسای منی خوایە . هەموو ئەوسێکسانەی لە نێوان ژنانی فرۆشراو و پیـاوانی کریاردا دەکرێ ، بێ هەست گۆڕینەوە و ئارامی ڕوح ، لای من تاوانە، حـەرامـە ، ئەو پیـاوانە جـێگەیان دۆزەخە کـە ئافـرەت لەبەر برسـێـتی و بێکاری و نەبونی سێکسیان لەتەکدا دەکەن.

ئەو تاوانەی محەمەد لە شەری خەیبەردا بەرامبەر بە صفیـەی کچی اخطب ی ژنی کنانی کـوڕی الربیع ی جـولەکـە کـردی و لەبەر چاوی صفیە دوای تالانکردنی مـاڵ و سامان وکوشتنی تەواوی خیلەکەی سەربازانی محەمەد سەری باوک ومێردەکەیان بڕی ، صفیە جوان وەک دەسـتکەوتی شـەر وغـەزا وەک مـەڕو بزن و هوشـتـر دەسـتی بەسـەرا گیرا.

(وا چەند ڕۆژە ئەم دوو عــاشــقــە هەڵاوی گــەرمی دەروونی یەکــتــری هەڵدەمـژن وتێر لـەماچ وباوەش وبۆنی سـینەی یەکـتری ناخـۆن . لەوە دەچێ تـەمـــەنی ئەم بـووک وزاوا تـازە لـەپـەردەکـــراوە کـــورت نێ . نهێنیەکی بێدەنگی خەبەری بەو دوو دەروون و دوو لەش و دووعاشقە دابێ... تەمـەنتـان کـەمی بەدەمـەوە ، مـاوە تا بوارتان هەیە یەکـتـری هەڵمژن ، تا دەتوانن یەکـتری بلێسنەوە ،تا تەڕایی لە ڕۆحتاندا ماوە تەکان بدەن ، وا بەرێوەیە هێرشی شمشێر بەدەستە ئەنفالکەرەکانی ئیسلام.

بەیانێکی زوو بوو، تازە بە تازە خـۆر بەسـەر سنگە لـمـاویەکـەی خـەیبـەردا پەخش ببـوو ، شـار وەنەوزی لەچاوانیـا نەتۆراند بوو ، جەستەکان کەنەفتی پشوی شەوی ڕابردووبوون و کەمێک تازەووزەی ، ئەرک وکـاری ڕۆژیان تیـا بزوا بوو . سـەربازو سـەردەسـتـە چاو و ناوگەڵ چنۆکەکانی ئیسلام بەئایەتی الانفال هارکرابوون .

ـ گـوێگرن ئەی سـەربازانی ئیـسـلام ، خـێـڵی خـەیبـەر جگە لەوەی زووربەیان جـوون و خـاوەنی سـامـان وزێڕ و مـاڵات و هوشـتـری زۆرن خانمانیان ، ئا، ئاخانمانیان و ژن وکچۆڵەکانیان شۆخن . شۆخیەک کــە نێــرینە هەرلەدوورەوە دەپەڕێنن . غـــەزایە و هەمـــوو شـــتێ بۆ سەربازانی ئیسلام ڕەوایە ، حەڵاڵە و هەموو شتێ لەپێناوی خودا دایە .

تێغی شـەهوەتی سەربازەکـان ، بۆ لـەشی ئافرەتانی خەیبەر ، لەدەمی شمشێری خوێناویان بەتیغتر بوو .

(صفیە و کەنانی ) عاشق وتازە بوک و زاوا ، هێشتا باڵیان لەکەمەر وملی و سـمتی ڕووتی یەکـتـری نەکردبۆوە لەناو جێگەی پڕ بۆنی تازە زاوایەتیـدا مـەست و بێـدەنگی چرکـە پڕ تامـەکـانی شـەوی ڕابووردوو بـوون ، دەنگی ســڵاوات و ئەنفــالە ئەنفــالە ، تاڵانیـــە ، غــەزایە تێکەڵاوی قـیـژەی ژنان و زروقـەی منداڵان و هاواری پیـاوان و بۆڕەی هوشتر دەبوو و بەئاگای هێنانەوە . کەنانی زاوا وصفیـەی تازە بووک

زۆر جاریاسای تورەی بێبەزی ئەنفالیان بیستبوو . بەسوورەتی ئەنفال و (وقاتلهم حتی لاتکون فتنتا ) ڕاچڵەکین .لەچاو تروکاندنێکا کۆڵان وشەقام ومەیدانەکانی شار خوێنی تێزا . کەنان دەیزانی بکوژرێت یان نا صفیەی جوانی لە دەست دەچێ و دەبێتە کەنیزەکی دەستی موسوڵمانەکان . چاوەکانی کەنان پڕبوون لە فرمێسکی ماڵئاوای و دوا بینین و دوانیگا و حەز ، باوەشێکی گەرمی بەصفیەدا کردوو تێر ناودەمی هەڵمژی .
ـ شیرینەکەم صفیە دەبێ بڕۆم .. دڵنیام ئەمە دوا ماچ و باوەشە ونام بینیتەوە ، دەجەنگم تا دەکوژرێم ، نامەوێت ببم بە کویلەی موسوڵمانان و بمخەسێنن ، نامەوێت بە کویلەیی وزەلیلی خۆشەویستی تۆوە بژیم . بۆیە لەپێناوی سەربەستیدا دەجەنگم تا دەکوژرێم دڵنیابە دڵدارە پاکەکەم ، کوژرانم لە پێناوی ڕاستیدایە . ئێمە تاوانمان نیە موسوڵمانەکان هاتونەتە سەرمان ، تالانمان دەکەن و دەمانکوژن . شیرینەکەم صفیەی جوان ، من دەڕۆم ، هەوڵبدە دوای ڕۆیشتنی من خۆت لە دەست موسوڵمانەکان قوتار بکەو خۆت مەدە بەدەستەوە تۆ شۆخیت وشۆخیت ئەوان شێتدەکات .. سەری خۆت بەرەو بیابانی چۆڵ هەڵگرە بڕۆ . باشترە قەل وداڵ ئەو لەشە نەرم و خرپنە نازدارەت و ئەو مەمکە قنجانەت بخوا ، لەوەی موسوڵمانەکان پیست بکەن .تا دەتوانی ئەولەش ولارە ناسکە ، ئەو دەروونە گەرمە پڕ عەشقە حەشار بدە چیان برد زێڕ ، هوشتر ، بەرگ ، مالات ، بابیبەن ، تەنیا پاکێکەت نەبێ ، من دەڕۆم و نەگبەتیە یەخەی گرتووین .
لەگەڵ باوکی صفیەدا پشتیان کردبووە یەکتری و هێرشی سەربازە دەست خوێناویەکانیان لەماڵ دوور دەخستەوە . دووان دەکوژرا سیان دەهات ، سایان دەکوژرا شەش دەهات ، چواردەوریان بەسەرباز گیرابوو. ووزەیان لەبەردا نەمابوو لە چەند لاوە قەبرغەیان کوون بوو. خوێن بەدەست ومەچەک و شان و مل وقەبرغەیاندا چۆڕاوگەی

بەستبوو . ووزەیان نەما ولەناو گۆمی خۆیدا گەوزان ، صفیەی تازە بووک وعاشق لە درزی پەنجەرەیەکەوە دەیڕوانیە ئەم قارەمانیەتەی کەنانی هاوسەرو دڵداری و باوکی دڵ گەرمی . سەری هەردوکیانیان بڕی و بەسەلاوات و هاوارەوە خۆیان کرد بە ماڵدا . ئاڵتون و کوتاڵ ومەڕ ماڵات هوشتر، کەوچک ، پیاڵە ، سەراپا ماڵیان ئەنفال کرد.
لە کۆمەڵە جل وبەرگێکی والای تازەی باوەشی سەربازیکدا بۆنی بن باخەڵی تازە بووکێکی لێ هەڵدەسا و شەهوەتانی سەربازی شێتی هەژان و سەربازی گەڕانەوە ناو ماڵ .
(دەبێ ئەم بەرگە والا و ئەم بۆنەشێتکەرە بۆنی ئافرەتێکی شۆخ یان بوکێکی چەند شەوە بێت ) .
سەربازی شێت کوون و قوژبنی ماڵ ، ژێرخان ، سەرخان ، گەوڕ، گەڕا لە ژێر جلە کۆنی ژێرخاندا ، پارچە مانگێکی حەشاردراوی دۆزیەوە و بە پرچ ڕایکێشایە دەرەوە . صفیە خوی نەدا بەدەستەوە ودەیویست بەلێنەکەی کەنانی مێرد وعاشقی بهێنێتە دی . دەیزانی چی بەسەردێ دەبێ بەکالا و دەکەوێتە بەر دەست محەمەدیەکان .
شمشێرێکی کورتە بنەی دەرهانی و بەرنگاری سەربازی چاو زیت و شەهوەت شێت و دەست خوێناوی موسوڵمان بۆوە .
ـ نا یان دەمکوژی یان دەتکوژم ، تۆ ناتوانی وابەئاسانی لەشی پاکی من بەو دەستە خوێناویە پڕ تاوانەت پیس بکەیت .
(بەرەنگاری سەرباز بووە) .
سەربازی بەئانفال گۆشکراو شارەزای مرۆڤ کوشتن و تینوی لەشی ئافرەتانی تالانی ، شمشێرەکەی لەدەستی صفیە دەرهانی و دواجار وەک داڵێک چنگی برسی لەسنگی نەرمی صفیە گیرکرد و بەقژ ڕاکێشا و پارچە مانگێکی لەسەر جلی ماڵاتی گەوڕەکە و لەژێر خۆیدا بینی ئەتکی کرد لە گەڵ تەکانەکانیا و بەدەم سڵاواتەوە دەیبۆڕان ،
(ئەمە سامان و زێڕە ، ئەمە دەستکەوەتە، هەزارەها بار هوشترە) لەشلی صفیەی پیسکرد ، هەردوو دەستی بەگوریسێک بەست

وبەدەمو لێوی خوێناوی وکراس وسنگ دڕاو، سەرو قژ ئاڵۆسکاویەوە وەک بزنێک بەدوای خوێدا ڕایکێشا بۆ ناو کوڕی ژنانی مۆڵدراوی تالآنی . صفیەی جوان وەک سورەچنارێکی قەدبارێکی بەهەڵە ڕواوی نیوان کۆمەڵە دارخورمایەک لە ناو ژناندا دیاربوو جوان بوو . شۆخ بوو و هەر ئەو ڕۆژە بەبڕیاری پەیامنێر و یاسای ئەنفال بوو بەهاوسەری سەربازێ و دوای چەند ڕۆژێک هەواڵی شۆخی و نازداری صفیە گەیشتە دیوەخانی پەیامنێر.

ـ قوربان شورەییە بۆ قوڕەیش سەربازێکی دەم ڕووت ژنەکەی لەژنەکانی تۆی ڕابەرمان جوانتر بێ ، ئەوە ژن نیە ، پەریەکە، پارچە مانگێکە و شەوێک لەشەوانی عەجاجدا لە مانگ بۆتەوە و کەوتۆتە خوارەوە ولە خەیبەردا گیرسابووە.

ـ گەورەم ڕابەر و سەروەر ، پێغەمبەری موسوڵمانان ئەو ئافرەتە پارچە مانگە هەر بۆ پیرۆزێکی وەکی بەڕێزتان باشە ، بڕوانکە دەبێتە چرایەک دیوەخانی پڕ ژنی بەڕێزتان ڕووناک دەکاتەوە.

هەر ئەو ڕۆژە بەزۆر لە سەربازیان سەندو بوو بە ژنێ لە ژنانی ڕابەر ژنێ لە هەموو ژنانی تری شۆختر و جوانتر و ناسکتر و نیانترو شەهوەتدارترو خەپانتر ، بۆیە هەر بەگەیشتنی صفیەبە دیوەخانی پڕ ژنی ڕابەر، بۆمبی بوغز و تووڕەبوونیان تەقیەوە .

ـ چۆن دەبێ ژنە جولەکەیەک لەئێمە جوانتر بێ ؟!

ـ هاوار ئێتر تەمەنی شەوەکانمان کورت دەبێ !

ـ ئیتر ژەمەکانمان بە مانگێ جاری بەرناکەوێ !

ـ ئیتر زێڕ کوتاڵی نوێمان چنگ ناکەوێ ئیتر ... ئیتر

صفیەیەکی جوان ودڵ و دەروون بریندار، باوک ومێرد سەربڕاو، دەبێ ژیانی لەگەڵ کوژەری باوک ومێردیداچۆن بووبێت ؟ ژیانی دۆزەخ بوو. لەسەر ویستەکەی کەنانی مێردیەوە بڕیاری دا یاخی ببێت ، خوی نەدەدا بەدەستەوە . بۆیە هەموو جاری پێش جووتبوونی ڕابەر لەتەکیا کۆمەڵە ئافرەتێکی قوڕەیشی مەچەک ئەستوری دەست وبازو کوتراو

حەسرمەی لەشی ناسکیان دەکرد و دەبووە پارچەیە گۆشت ولەبەر حەزی ڕابەردا دەکەوت . صفیە گەنج بوو ، جوان بوو ، دڵی بە ڕابەری پیرەوە نەبوو . بە دوژمنی خۆی دایدەناو لەترسا و بەناو ببوو بەموسوڵمان . موسوڵمانێکی دڵ جولەکە، بڕوای وابوو هەر کەسێک ببێ بەئیسلام کافر دەبێ وپشت لەخوا دەکات . بۆیە هەموو شەوێک کە خێڵی قورەیش دەنووستن ، دەچووە سەر شوێنێکی بەرزو ڕوویدەکردە ئاسمان ، بەنیازی قسەکردن لەگەڵ مندا و دەکوڕوزایەوە و دەدوا ، ئارامی دەدا بە دەروونە سوتاوەکەی . بڕیاری دا یاخی ببێ یاخی لەوەی ئاگری حەزو گڕەکانی دەروونی بشارێتەوە . ڕۆژگار ڕۆیشت وبە لاوێکی قۆزی هەڵهاتوی خێڵەکەیان ئاشنابوو. لەپشت ڕابەرەوە پەیوەندیان بەست سکاڵاکانی دەروون و ئازارەکانی لەشی بۆ دەگێڕایەوە ، ئازارەکانیان هاوبەش بووو گرفتەکەیان یەک سەرەداوی هەبوو . لەیەک نزیککەوەتنەوە و نهێنیەکانیان بۆ یەکتری هەڵدەڕشت. ووردە ووردە پەیوەندیەکەیان بوو بەهاوڕێیەتی ، بووبە دڵداری و لە باوەشی بەزەییەوە بۆ ووردە ماچ . لە ووردە ماچەوە بۆ بازی مەمک و گۆپکە مژین . ووردە ووردە ڕوتبوونەوە وبوون بەدووعاشقی یاخی ، یاخی لەو یاسا وکۆمەڵە بێ بەزییی ئەنفال . بێ یەکتری نەدەژیان لەشەوانی ئەنگوستەچاوی تەنیایدا لەناو چڕە دارخورماکاندا یەکیان دەگرت ودوای چیرۆکی ژیانیان بۆ یەکتری ونیشاندانی جێ لێدان وداخەکان لەشی یەکتریان دەلستەوە .

ـ ئەی خوای گەوەرە ومیهرەبانم ، چاک دەزانی لەو ڕۆژەوەی لەگەڵ کەنانی دڵدارمدا بەیەک گەیشتبووین نەسەر پێچی یاساکانی تۆی گەورە ومهرەبانم کردبوو نە ناپاکیم بەرامبەر بە کەنان و خۆشەویستیەکەمان . دەسەڵاتم بەسەرئەم زاڵمانەدا نیە تۆ بەو سەرەوە ئاگات لێیە بەچ شێوەیەک لەگەڵمدا جووت دەبێ . هەموو ئیسقانەکانی جەستەم زریکەی فەلاقەی لێهدەستێ و لەشم پارچە پەڵەی داخە . دەسەڵاتم چیە جوانم ، دەزانم جوانی من دیاریە و تۆی

مەزن و میهرەبان پێت بەخشیوویم . تۆو گەورەیی خۆت ، تۆو مەزنی خۆت ڕزگارم بکە وبمکوژە . ئاخر چۆن بتوانم لەگەڵ کوژەری باوک و مێرد و دڵدارەکەمدا بژیم ؟ سێکس بکەم ؟ کە هەمووسێکسی لاقەکردنە ، ئازاردانی دەروونە ، جەستەیە .
شەوێک لەشەوانی ژووان بوو ، ژنێک لەژنەکانی ڕابەر بەم نهێنییەی زانی ولە چاوتروکانێکدا خێڵی قورەیشی ئاگادارکرد ، دوولەشی ڕووتی لەیەک ئالاویان لەناو پەلە دارخورمایەکی چڕدا گرت چیرۆکی کوڕە جولەکە وصفیە بەناو قورەیشدا بلاو بووەوە . یەکێک لەژنەکانی ڕابەر دۆستی هەیە ، بۆژنانی تری ڕابەرهەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو . شانسێکی بەتەمەن بوو ، بەڵکو بەهوی ئەمەوە صفیەی جوانی جوولەکە لەناویاندا نەمێنێ : ژەمی زیاترو ئاڵتون وکوتاڵی ئەنفالیان زیاتر بەرکەوێ ڕابەر بڕیاریدا دۆستەکەی صفیە خێرا بگرن ، بەتاوانی تاوانکردن بەرامبەر بە ڕابەری مەسوڵمانان و نوێنەری خوا لەسەر زەوی سەری ببڕن و صفیەش زیندانی نکەن زیندانیەک تەنیا پاسەوانکەی نەبێ کەس بۆی نەبێ بیبینێ . هەردوو چاوەڕەشە مەستەکانیان دەرهانی ، پرچە درێژە شەهوەتاویەکەیان بڕی و سەریان پاک تاشی ڕۆژی لەتێ نان و جامێ ئاوی سوێریان دایە . چاڵی چاوە گەشەکانی کێمیان تێزا ، میکرۆب بە مۆخیا شۆڕبووە لە ناوەڕاستی تەمەنیەوە ئەو شۆخە ژنە لەکونجی زیندانێکی تاریکدا بەکوێری دەژیا .
لەوێش لە کونجی زینداندا ، دڵێکی هەرلای منی خوا بوو ، بەکوێری ڕوویدەکردە من و ئەو پرسیارانەی دەکرد :
ـ ئەی خوای مەزن ، من تەنیا تۆم هەیت ، تۆش فریام ناکەویت ، لەم دۆزەخە ڕزگارم ناکەیت . چۆن ئەو زاڵمانە چاوی گەش و لەشی ناسک و قژی دریژیان لێسەندمەوە ، کە ئەمانە گشتی دیاری تۆی پەروەردگارو مەزنە. دەتۆش ئەو ژیانەی پێت بەخشیووم لێم بسێنەرەوە . ئای خوای میهرەبان وبەتواناو دروستکەری هەموو

بوونەکان ئایائەم تاوانانەی لەمن وکەسانی تر دەکرێ ویستی تۆیە؟ ڕۆژانە هەزارەها جار ئەم پرسیارەی لێدەکردم ، تا دوا چرکەی ژیانی ئەو لەشە ناسکەی هەتاوی نەبینی ، لە داو کاتدا لەبرسێتی وتینوێتیدا ، لەکونجی زینداندا مرد هەرلەیەکەم ساتەوە ئەم ئافرەتە داماوەم خستە بەهەشت ) .

تاوانی جیاوازیکردن و چەوساندنەوەی ژنان بەوەی ، هەر ژنێکی جوان و گەنجی لە ژنە کۆن وپیرەکان تر زیاتر ئاڵتون و پارەی وەرگرتووە زۆرتر سێکسی لە تەکدا کردووە بەم هۆیەشەوە چەوسانەوەی دەروونی لەسەر ژنەکانی داناوە . ئەمەش سەرپێچی یاساکانی منە ، من دروستکەری هەموو جۆرە مرۆڤێکم . چۆن دەبێ بەناوی منەوە ئەم تاوانە بەرامبەر بە کەسانێک بکات کە من دروستمکردوون . من نەم ووتووە وولاتان بەناوی ئیسلامەوە داگیر و ئەنفالیان بکات . ماڵ و نانی هیچ کەسێک بەکەسێکی تر حەلاڵ نیە.چەوسانەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە یاسای من نیەمن . بەشی هەمووان دەدەم وڕازی نیم هیچ کەسێ بەشی کەسێکی تر داگیر بکات منداڵی خۆی تێر و کەسانی تر برسی بکات . کەی ئەمە یاسای منە، ئەوە یاسای ئێوەی مرۆڤە ؟ .

خوا بە دەنگە پڕ ئاواز و ئاسودەکەرەکەیەوە قسەی دەکرت وئەمیش بەدڵەوە چاوەکانی نوقاندبوو ، ئارامی دەروونی لەشی دەجولاند .

ـ لەو ڕۆژەوەی مرۆڤ دروست دەکەم تا دواچرکەی ژیانی ، لە ژێر تاقیکردنەوەی مندایە سزا و مهرەبانی و پاداشتی من زۆرن . دۆزەخ بەشێکە لەسزاکەم لە دۆزەخ خراپتر زیندووکردنەوەی مرۆڤە دڕندەکانی سەر زەویە، بە شێوەی سەگ و پشیلە و هوشتر و گیانەوەرەکانی تر. تا لە لایەن مرۆڤەوە بچەوسێنرێنەوە . هەر بەمەبەستی ئەوەی مانای چەوسانەوە بچێژن ، ئەو هەموو سەگە گەڕو پشیلە لەڕ وهوشتر و کەر و ئەسپە برسیانەی سەرزەوی ، ڕۆحی مرۆڤە چەوسێنەرەکانی دنیایان لە لەشدایە ، چۆن وانەکەم ، ئاشتیان سووتاندوە و مرۆڤیان

برسـیـکردوه ئافـرەتیـان لاقـەکـردوەو چەوسـاندۆتەوە، مندالّیـان هەتیوکردووە هەر سەگێک و هەر گیانەوەرێکی گەڕو برسی سەر زەوی سەرکردەیەکی سیاسیە، خەلیفەیەکی دڕندیە ، بەلاّم ناتوانن قسە بکەن گەر مرۆڤ هوشیار بێ وسەیری قولاّیی چاویان بکات ، مێژووی کاتی مرۆڤ بونیان دەخوێنێتەوە .

( بروسکەیەک لەدلّی داو غەمی دایکی ڕایچلّەکان) .

(تۆ بلّێ دایکم ئیستا ئاژەلّێک بێ و لەسەر زەوی ؟. بەخوا بەدوایدا دەگەڕێم . لەهەر شوێنێک بێ پەیدای دەکەم . بەئاژەلّیش دەیپەرستم و خزمەتی دەکەم . خواردنی باشی دەدەمێ ، شوێنی پاکی بۆ تەرخان دەکەم ، دوودلّ بوو ) .

( بڕواناکەم دایکم تاوانێکی کردبێ ؟ بۆ نا ؟ من نازانم دایکیشم مرۆڤە و مرۆڤیش بێ هەلّە نیە . پرسیارەکانی تەوا نەبوو خوا وەلاّمی دایەوە ) .

ـ نا .. نا دایکی تۆ نابێ بەئاژەلّ ، ئەو پاداشتی خۆی وەرگرتووە وجێگەی بەهەشتە!

(سەر سامی و دلّخۆشیەکی زۆر هەلّی پەڕاند دایکم لە بەهەشتە ئەی خوای گەورە و مهرەبان ئاخر نە دەولّەمەن ونە دەسلاّتدار و نەپێغەمبەر بوو ؟).

ـ بەهەشت تەنیا بۆ پێغەمبەران و دەولّەمەندان و دەسەلاّتداران نیەکەس نازانێ پاداشتی بەهەشت لە سەر چی دەدرێ ، تەنیامن نەبێ . لەبەر ئەوە دایکت بەهەشتی پێبڕا چونکە سەر پێچی ویستەکانی منی نەکرد وچ فرمان وئارەزوویەکم پێدابوو جێبەجێیکرد. هەر لە سەردەمی لاوێتیەوە دلّداری کردووە کەسێکی تینوی وەکی باوکتی تێرئاوی خوشەویستی و ماچ وسێکس کرد . ڕۆحی باوکتی ئارام کرد. بۆیە جیێ بەهەشتە . دایکت ئافرەتێکی پیرۆز و ئازایە، دژی یاساکانی مرۆڤ وەستاو یاساکانی منی خوای هەلّبژارد . دلّداری کردووە و بەدلّی خۆی شویکردووە دایکت کە یەکەم ماچی

بەباوکت دا باوکتی وەک مرۆڤێکی برسی تێر کرد .یاسای من وایە.
هەر کەسێک هەتیوێ تێر بکات ، دەروونێ بەختیار بکات ، گڕی
حەزی کوڕە هەرزەکارێ کچە عازەبێ ، بێوەژنێکی گڕگرتوو
دابمرکێنێتەوە ، جێگەی بەهەشتە دایکت پیرۆز بوو وەک ئەو
مرۆڤانەی مرۆڤایەتی قیبلەیانە ، ئەو مرۆڤانەی منداڵێکی هەتیوو
تێر دەکەن ، یارمەتی ئافرەتێکی بێدەرەتان دەدەن . دەستی پیرێک
دەگرن ، ئاژەڵێک تێر دەکەن ، دزی ناکەن ، ئاوی درختێکی تینو
دەدەن ، درۆ ناکەن ، سێکس لەدڵ و ڕوحەوە دەکەن و ماچ بەحەزەوە
دەکەن . ماچ یانی بەخشین وگۆڕینەوەی بەختیاریە. بڕوانن چ کە
جوانە نێر و مێیەک دەمی یەکتری هەڵدەمژن . ئەوە دەیاندەوێ تەڕایی
ناخی یەکتری بنۆشن . سێکس یانی خواردنی ڕۆح وتێر بوونی ڕۆح.
کەواتە ئەوانە بەختیاری خۆیان و گشت کەسیان گەرەکە. ئەو کەسانە
بالە دنیاشدا خاوەنی سامان و دەسەڵاتیش نەبووبێتن بەڵام جێگەیان
لای من بەهەشتە .دایکت دەسەڵاتی بەسەر ئارەزووکانیدا هەبوو. ئەو
ئارەزوویانەی من پێم دابوو ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد و بێ دڵی
خۆی و ویستی منی نەکرد. تۆ نازانی باوکی تینویت چەند بەو باوەش
و ماچەی دایکت ئارام بوو . کاتێک باوکت لە دواچرکەی ژیانیا
زمانی شکاچەند ویستێکی هەبوو، ئەویش وێنەی دایکت لەچاوان
وتامی یەکەم ماچی بن دارسێوەکانی شارباژێر لە سەر لێوی و ڕوحی
بمێنێ وپێکەوە بمرن دوو ویستیم هانیە دی ، ویستی پێکەوە
مردنیانم دوا خست تا تۆ و خوشکان و براکەت بێناز نەبن ، ئێوە
نازانن من چەند میهرەبانم .
ببووە دەروێشی قسە بەنرخەکانی خوا وتێری لە گوێگرتن نە دەخوارت
. تاگۆی لە ووتەکانی خوا بگرتایە ئەوەندە هەستی بەئارامی و
بەختیاری دەکرد . بیری ڕووی ناشیرین و زیبکاوی و لووتی
قۆقزوخواری خۆیکردەوە و ڕوویکردە ڕووناکیەکە .
ـ ئای خوای گەورە ، تۆ ئەوەندە مهرەبان و مرۆڤ دۆست و بەتوانایت

نەدەوبوو دیکۆرێکی جوان وشانسێکی باشت پێببەخشیمایە ، واتەمەنم نیوەی ڕۆی و بچوکترین ئارەزووەکانی سێکسم نەچەشتوە وساتێک بەختیاریم نەدیووە . خۆ من دژی یاسای تۆ نیم . دەمەوێت لە ڕۆحەوە سێکس بکەم و بە ڕێزەوە ئافرەتێکی ویستی ئەم دڵە غوربەتاویەم لە باوەش بگرم . نەدەبوو کوڕێکی قۆزو جوان بومایە ؟. کاردار و پارەدار و لەکۆمەڵگایەکی ئارامدا دروست ببومایە ؟ دەکرێ ئەمانە سزا بێ و تۆی مهرەبان بەزیندویەتی دەمدەی ؟بە گەورەیی و مهرەبانی تۆ سوێند دەخۆم ، تا ئێستاچۆلەکەیەکم لەئاو نەکردوو ؟ دزیەکم نەکردووە ؟ ماچێکی بەزۆر و بەخۆشی و بە پارەم نەکردووە . ئەی ئەم هەموو ئازارە دەروونی و جەستەیی و ڕۆحیە چیە من دەیچێژم؟!

ـ ناکرێ هەموو مرۆڤەکان لەیەک بچن . ئەمە یاسای سروشتە و من و سروشت هاو ئاهەنگین . لەو ڕۆژەوەی ئێوەی مرۆڤ دروست دەبن بەرامبەر تاقیکردنەوەی ژیان دەبنەوە ، ئەو ئافرەتەی لەبەر لووتی قۆقز وخوار و ڕووی زیبکاوی تۆ ماچ و خۆشەویستیت ناداتێ ، تاوانبارە بەیاساکانی سروشت و من . تۆ ڕووت ناشیرینە ، وەلی دیوی ناوەوەت دەرونت جوانە . ئەمەش جوانیە بۆ مرۆڤ . ئەم جوانیە دەرونیە گەوهەرە و هەموو کەس ناتوانی بیبینێ . من بەشی هەموو مرۆڤێک دەدەم بەشی جوانی تۆ شاراوەیە و هی کەسێکی تر ئاشکرایە ئەمە جیاوازیەکەش ئێوەی مرۆڤ دەروونی یەکتری ناخوێنەوە تاوانەکەش تاوانی ئەو بازاڕەیە جوانی و ناشیرینی مرۆڤی تیا مامالە دەکرێ . ئەمەش بازاڕ و یاسای ئێوەیە نەک من . مادامێکی تۆ مرۆڤی ، دەبێ مافەکانت بپارێزرێت . گەرمرۆڤەکەی بەرامبەرت بەمە نەزانێ یانی لە هەستە مرۆڤایەتیەکان دابڕاوە کە مرۆڤیش لە وهەستانە دابڕا ، یانی لەمنی خوا دابڕاوە و دژی ویست و یاسای منە.

خۆی بەکەساس و نەگبەت هاتە بەرچاو . لەگەڵ گوێگرتنی ووشە و

دەنگە ووزەبەخشەکەی خوادا ووردە ووردە ملی نەگبەتی لا بەلاوە و دیمەنی سکرتێرە قژ زەردەکەی هانیە بەرچاو وئارەزووی ماچ و سێکسی لەتەکیا جولاو ئاهێکی هەلکێشا ، ڕووناکی پشتی شاخە هەوورەکەش نەما . ڕاچلەکی و هاواری لێهەلساو بەچەپۆک کەوتە سەروچاوی خۆی.

ـ خوام توڕەکرد . ئەو ئاگای لەهەموو هەست ونەستێکی مرۆڤە. ئەم خەیالە نەعلەتیە چی بوو لەم کاتەداهاتە کەللەم ؟ تۆبە خوایە ، سەد جار تۆبە لێم مەگرە ، جارێکی تر بیری واناکەمەوە .

هەورەکانی ژێر پێی کەوتنە خرتەخرت وجولە جول و ووردە ووردە لەیەک جیادەبوونەوە . ژێر پێیەکانی درزی تێکەوت . هەموو ئەندامانی لەشی لەرز دایگرتن و چەند جارێ بۆ خۆ ڕزگارکردن شوێن پێیەکانی گوێزایەوە .دەچووە هەر شوێنێک هەورەکانی ژێر پێی دەترازان .لەجێگۆڕکێ ماندوو بوو. لەشوێنێکدا وەستاو بەکول دەستی بەگریان کرد . چاوەڕێ دەکرد بەڕۆخی هەورەکاندا بچێ و بترازێتە خوارەوە و هەپرون بە هەپرون ببێ . بالەکانی لەخۆی ئالاند و چاوەکانی نوقاند ، ووردە ووردە درزی هەورەکە فراوان بوو ، هەموو لەشی قوتداو بەئەسپایی و بێ ئازاردان خزایە خوارەوە . وەک دوو دەستی نەرم و شل باوەشیان پێداکردبێ ، لە سەر چیمەنێکی نەرم وشلی ناو باخچەیەکی پڕ گول و گیای جوان ودرەختی بەرداری گەشاوە و ئاو هەوایەکی دلفرینێی بۆن خۆشدا دانرا . چاوە ترساویەکانی کردەوە و وەک شێت بەچواردەوری خویدا دەیڕوانی . نیگای ئەبلەقبوونی لێدەتکا . جۆگەیەک ئاوی ڕوون بەتەنیشت چیمەنەکەدا دەڕۆیشت . گولەکانی قەراغ و ناو جۆگەکە وەک چۆن مرۆڤ بە ئاوازی مۆسیقایەکی دلبەخش خۆی دەلاوێنێتەوە ئاوا گۆپکەی خونچەکان سەریان لە تەک خووڕەی ئاوەکە دەجولان . هەلسایە سەرپێ و ڕوونتر ڕوانیە دەوروبەری خۆی لە هەر بن درەختێکدا ئافرەت و پیاوێکی ڕووتی لەیەک ئالاوی بینی . ناودەمی یەکتری

هەڵدەمژن و بەسەر لاشەی یەکتریدا دەتلێنەوە . هەرجووتە مرۆڤێک بەلایدا تێدەپەڕی بەمهرەبانی وسۆزەوە سلاویان لێدەکرد . ڕووەکان گشتیان زەردەخەنەیان لێدەتکا وکەس مۆڕەی لەکەس نەدەکرد .هەر خۆی بەتەنیا بینی هەموو جووت . بوون بەسەرسوڕمانەوە بەناو باخچەکەدا کەوتە گەڕان و دەیڕوانیە دیمەنە جوانەکانی بن دارەکان . ماچ ، باوەش سێکس ، مۆسیقای ناسک ، لەیەک ئالاّن و نەرمە ئۆفی تەواو بوون٠
( چی دەبینم خوایە ئەمە کوێ یە ؟؟ ) .
لەناکاو ڕووبەڕووی دوو ڕووی ئاشنا بۆوە ئا ( مچە بێوەژن وئافتاوەڕەش )
ـ ئێوە لێرە چی دەکەن ؟ خۆ چەند ساڵە کوژراون ؟
بەسەرسلاوێکیان لێکرد ولەچاو تێپەڕین
( هێشتا لەقوناغی ئامادەیدا بووهەواڵی کوشتنی مچە بێوەژن و ئافتاوەڕەش بە شاردا بلاو بۆوە مچە هەموو کونج وکەلەبەری کۆلاّنە هەژارەکانی مەڵکەندی و خانوەقوڕەکان و حاجی حان شارەزابوو. ژمارەی بێوەژنانی لا تۆمار بوو . مێژووی بێوەژن بوونیان ، تەمەنیان ژمارەی شوکردنیان ، پلەی گەرمای لەشیان ، سنووری عاشق وڕۆحیان ، عاشقی بێوەژنان بوو ٠
ـ ئەرێ مچە تۆ کەی واز لە بێوەژن و کۆلاّن کوتی دەهێنی ؟ ئەوەندە دوای بێوەژنان کەوتووی ، خەڵکی ناوی باوکتیان لەبیر چۆتەوە بێوەژن بۆتە نازناوت !
ـ ئەی چیبکەم برالەتاو هەژاری نە ژنم بۆ دێ و نە بەم شەڕواڵ و کراسەوە شۆخەکانی سلێمانی بۆمن ڕادێن ؟ . ناهەقم مەگرە واگرم تێبەربووە ٠ جگە لەوە ، تۆ نازانی باوەش و ماچی بێوەژنان چەند گەرمە ، چەند بەسۆزە.. ؟ هەر ئەوان نرخی ماچ وباوەش و بۆنی بن باخەڵی پیاوانیان لایە! ٠
مچە هەر لەقوڕەکاری دەهاتەوە ، دوگلەکەی دادەهانی وکلاوەکەی دەنا

بەلایەکی سەریەوە و بەرەو کۆڵانەکانی شار ڕێدەکەوت . زۆر شارەزای دەستەمۆکردن و ڕاهێنانی بێوەژنان بوو . ناوبانگی تەڕی وجوانی وگەرمی ئافتاوە ڕەش بەگەڕەکدا پشابوو . بۆیە مچە وەک ڕاوچیەکی شارەزا خوی بۆ ئافتاوەڕەشی نێچیری خرپنی دەروون گرگرتوو نابۆەوە، نیوەڕۆیەکی قرچەبوو ، ئافتاوە ڕەش نیشانەی ئامادەگی خۆی بۆ مچە دیاری کردبوو . بەردەرگاکەیانی پاک گسکدابوو وئاوڕشێنێکی تەنکی کردبوو و درزێکی خستبووە دەرگا تەختە ئەستورە قوبەدارەکەی حەوشەکەیانەوە . مچە فرسەتی هانی و خۆی بە ماڵی ئافتاوە ڕەشداکرد و هێشتا فریای دوو ووشە نەکەوت پەلاماری یەکیان داو ، ئافتاوەڕەش لەجیاتی ماچ ، بەووردەگاز ڕوومەت ولێو و سمێڵ وگۆپکەی مەمکە توکاویەکانی مچەی پچڕی . کلپەی هەردووکیان هێندە بەجۆش بوو، سەرتاپای لەشیان چوە سەر ئاوی حەز وشەهوەت وەک دوو پارچە ئاسنی سوورەوەکراو لە ژێر خانەکەی ماڵی ئافتاودابەسەر یەکدا توانەوە . ئافتاو دەیویست گڕی چەند ساڵ بێوەژنکۆشی وکلپەی ڕۆحی گڕگرتووی ، بەچەند جار تەواوبوون دابمرکێنێتەوە . لەتەکانەکانی جاری سێهەمدابوون کە لەناکاو کوڕە شەقاوەکەی ئافتاو بەسەرئەم دوولاشەڕووت و دیمەنە ڕۆمانسیەدا هاتەوە و هەردووکیانی کوشت . ڕوحی ئەم دووانە، بە بەرچاوی دانیشتوانی گەڕەکەوە دەبنە دووپەپولەی باڵ ڕەنگینی جوان ، لەپەنجەرە بچکۆلەکەی ژێرخانەکەوە دەدەنە شەقەی باڵ و بەئاسمانی شاردا بەرو قولایی بۆ بەهەشت هەڵفڕین. )

هەر پرسیارێکی لا دروست دەبوو ، دەنگێکی ناسک لەمێشکیا وەلامی دەدایەوە .

(خوای گەورە من چی دەبینم ؟ . ئەوە ئافتاوە ڕەش و مچە بێوەژن لێرە چی دەکەن ؟

دەنگەکە ووتی :

ـ مچە بێوەژن و ئافتاوە ڕەش ، نمونەی دوومرۆڤی چەوساوەن ، لەو

ڕۆژەوەی مێردەکەی ئافتاوەڕەشی بەجێهێشت ، هەزارەهاشەوی بەئازاری دەروون و گنگڵی ڕۆحەوە بەڕێدەکرد ، بە تەنیایی لەژێر لێفەکەیەوە دەگریا ودڵی پەنجەکانی ئاگری دڵ و کڵپەی ڕۆحی دانە دەمرکانەوە . ئەو حەزی لە بۆنی سەرسنگ و ماچی سمێڵ و دەستی زبری پیاوانی کرێکار و هەژاران بوو . چونکە هەر لەتەمەنی سیانزەساڵانیەوە لەگەڵیاندا ڕاهاتبوو. چی بکات مێردەکەی کیژۆڵەیەکی لادێ نشینی کڕی و ئافتاوی بە برسێتی ڕۆح و سێ منداڵەوە لەشاردابەجێهێشت ؟ ئافتاوەڕەش دەیویست یەکێ لە ویستەکانی خوا جێبەجێبکات . کوڕە شەقاوەکانیشی هەڕەشەی کوشتنیان لێکردبوو گەر بیر لە شوکردن بکاتەوە ، دەیکەن بەقوربانی گوللەیەک . ژیانی ئافتاوی بێ پیاو دۆزەخێک بوو ، کۆمەڵەکەی و منداڵەکانی بۆیان سازکردبوو . هێشتا تێری لەژیان نەخواردبوو کە لە نیوەی تەمەنیدا بێوەژن کەوت . لە نیوان بەرداشی حەزو ترسی کۆمەڵەکەی ژیانی دۆزەخ بوو مچەش لەنێوان گڕی هەژاری و گڕی ویستەکانی ڕۆح ودەروونیدا سوتابوو . ئەم دووانە لە سەرچەپکە ماچێ ، لەسەر باوەشێکی گەرم ، ژەمێ سێکس و تامێکی ڕۆح کوژران . ئەم دووانە قوربانی جێبەجێکردنی یەکێ لە ویستەکانی خوان .شۆڕشگێڕ بوون و لەپێناوی ماف و ویستەکانیاندا کوژران .
بۆیە دوای ئەو هەموو تاوانەی لێیان کرا جێگەیان بەهەشتە . )
تێگەیشت ئێرە بەهەشتە ؟
ـ ئای کە خۆشە ، لەبەهەشتا هەژاری ودەوڵەمەنی نیە . لێرە جیاوازی ڕەنگەکانی مرۆڤ نیە .بۆیە هەمووکەسێک زەردەخەنەی لەسەر لێوە. وەک ناوشارەکەی من نیە و ڕەش پێست وڕەنگ تۆخەکان نابوغزرێنرێن ، لێرە سلاویش نەکەم سلاوم لێدەکەن . لەناو شار چەندهاجارسلاوی تەنیاییم لەخەڵکی کردوە وەلامێکی سادەشم وەرنەگرتوە ، نەک زەردەخەنە . لێرە هەست بەتەنیایی وئازاری غوربەت وبێگانەبوون و بێ نیشتمانی ناکەیت . چەند خۆشە سەر

زەویش وا بوایە و مرۆڤەکان یەکتریان خۆش بویستایە . ژیان بێگرفت و شەڕ بەرژەوەندی ، ئای کە مرۆڤ زاڵمە ، هەر لەبەر بەرژەوەندی ئەو جیهانە خۆشەی لەخۆکردوە بە دۆزەخ . لەسەر زەوی چەندەها میلۆین مــرۆڤ برسی و بێکارە . لێــرە هیچ ، لە ســەر زەوی ڕۆژانە چەند ئافــرەت لەســەر چەپکە مــاچێ ، باوەشــێکی گــەرم ، یان تەکــانی دەکوژرێ ولوتی دەبڕدرێ . ئای چەند جوانەکە لەم بەهەشتە جوانەدا ئافرەتەکان بێسەرپۆش و عەبان ، ئەو دیمەنانە چەند جوانە ئافرەتان وپیاوان بەدەم یەکەوە پێدەکەنن وماچدەکەن ، سێکس دەکەن ، کەس ڕەخنەیان لێناگرێ ولییان توڕەنابن و هەڕەشەو تفیان لێناکەن . هەموو کەسێک ئازادە ، بۆیە پۆلیس وسەرباز و جەندرمە وچەک بەشانە تۆقێنەرەکان لێرە نیین . ئای کە مرۆڤی سەرزەوی زاڵمە خۆی بۆتە کۆسپی حەزەکانی . کەخۆشە مرۆڤ بەختیار بێت ، ئازاد بێت !

هەر دەگــەڕا ومــاندوو نەدەبوو. هەردەگــەڕاو دیمــەنی جوانی وباخ و باخات و پڕ میــوە و ئاوی سازگاری سەرنج ڕاکێشەری دەبێنی . مرۆڤی ڕەش سپی ، زەرد ، ئەسمەری بەکۆمەڵ وجووتەوە دەبینی . بەتەنیا لەقەراغی جۆگەیەکدا دانیشت و چەند مست ئاوی خواردەوە. تام وبۆنێک لەگەڵ ئاو خوردنەوەکەدا بەڕۆحیا چوو. هەستی بەمەستی و خەیاڵێکی زۆر خۆشکرد ویەک دوومستی تری خواردەوە . وەک قاپێ ویسکی خواردبێتەوە مەست بوو وئارەزووی سێکسی گڕی گرت .ناو گەڵی گەرم داهات و قەبەبوو . بەپشتا لەسەر چیمەنەکەبە مەستی و خەیاڵێکی خۆشەوە پاڵ کەوت ، چاوەکانی نوقاند و ئەندێشەی حەزوئارەزووی سێکسی بردەوە بۆ لای سکرتێرە قژزەردەکە .

ـ ئێستا ئەو شۆخە لە کوێ یە ؟ و چیدەکات ؟ .ئای خوایە چەند خەیاڵێکی خۆشە ، ئەوە ئاو بوو یان شەراب و ویسکی کۆنیاک و کۆکتیلە ؟.

لەناکاو دەستێکی ناسک و نەرم بەڕوومەتاکانیا خشاو چاوەکانی

کردەوە ، بەپرتاوخۆی بەرزکردەوە ، سکرتێرە قژ زەردەکەی لە تەنیش خۆیەوە وبەچیچکانەوە و بەڕووتی بینی . بە پێچەوانەی ژووری کارگەکەوە بەزەردەخەنەو مهربانیەوە سەیری دەکرد ودەستی بەڕوویدا دەهانی . قژەزەدرەکەی بەسەر شان و مل ومەمکۆڵەکانیدا شۆڕببوونەوە سەیرێکی خۆیکرد وخۆی بەڕووتی بینی .بەبێ دەنگی هەڵیسانە سەرپێ و لەگەڵ هەڵسانیدا ، قنجی مەمکەکانی سکرتێرەکە زیاترهەڵتۆقین وگۆپکەکانی سوور هەڵگەڕان . سکرتێرەکە پەلیگرت بۆ بن درەختێکی کورتە بنەی باوەش پان . هەواو و بۆنی گوڵ وگوڵزاری ئەوناوچەیە لە دەوریان ئالاو نوساندی بەخۆیەوە. دەرروونی گڕی گرت وتوکی سەرسنگی ئەم وگۆپکە خرپنەکانی سکرتێرەکە گڕوگاڵی حەزیاندەکرد . لە باوەشی گرتبوو و بەگەرمی و حەزێکی هەرزەکارانەوە باوەشی پێداکرد و لەیەک ئالان .تا قەبارەی دەمی ڕێگەی دا لێوە قاوەیی تەڕەکانی مژی . بەشەیدایی لە پەنجەکانی پێوەی تا دوا مووەکانی سەری بەماچ لێسایەوە. سکرتێرەکەش بەتووندی بەلەشیەوە نووساندبووی و داوای گەرمی و تەکانی زیاتر وماوەی درێژتری لێدەکرد . بۆن و تامی دەمی هەنگوینی لێدی .گۆپکەکانی مەمکی شیرینی لێ دەتکێ .لەنیوان ڕانە خرپنەپێست کالاکانیدا پاڵ کەوتبوو سکرتێرکەش هەردوو پاژنەخڕ ونەشیمیلانەکانی لە پشتەوە لەپشتی گیر کردبوو . بە مۆسیقای ئۆف و دەنگی هەناسەی سێکساوی دەروونی دەلاواندەوە .بۆ یەکەم جار تەڕایی ڕۆحی ڕژایە ڕۆحی ئافرەتێکی خەیاڵیەوە . ئەمەجارێک ئەمە دووان ، نازانم چەند جار ئای کەخۆشە ، ماندوو نەدەبوو . تێر ناخوا ئارەزوو وناوگەڵی سارد نەدەبۆوە .بوون بە بەشێک لە سێکس جارێک ئەم لەسەرەوە وجارێک سکرتێرەکە. بەسەر چیمەن وگوڵ و گوڵزارداتلانەوە وخزانە ناو گۆمی ئاوی بۆن خۆش و ڕوون و پڕگۆڵ وگۆڵزار وچەپکە لەشی ڕووتی باریک و خرپنی ئافرەت و پیاو . لە قەراغ گۆمە شەرابەکە پاڵ کەوت و بەزمان

دڵۆپەشـەرابە جـێـمـاوەکـانی لامل وژێر مـەمکەکـانی وقـوڵایی ناوکی وسـەر سنگ و وورگ و نیـوان مەمـکەکـانـی سکرتێـرەکەی دەلـسـتـەوە وتامـێـکی خـۆش و خـەیاڵـێکی زۆر و ئارەزوویەکی سـێکسی فـرەی بەجەستەداچوو ٠

ـ ئەمە ئاوی بەهەشتە وکەس لێی تێر نابێ ، ئارزوو هەڵسێنەرە٠ لێرە مەی حەرام نیە بۆیە هەموو کەسێک مەستە .

چەند مـسـتـێـکی یەک لەدوای یەکی هەڵقـوڕاندو ئارەزووی سـێکسی گڕی گرت ، سکرتێرەکەش بەڕووتی و بەپێکەنین و قریوەی ناسکەوە بە دەوریا دەخولایەوە و شەڕە شەرابی لەتەکدا دەکرد ٠

بەقریوە و ووردە ماچەوە وەک دوو ماسی عـاشق خۆیان بەژێر ئاوەکەدا کرد هەناسەیان قـورس نەدەبوو. لەژێر گۆمە شـەرابەکەدا چەند لاشـەی ڕووتی ئافـرەت وپیـاوی لـەیەک ئاڵاویان بینی . وەک پارچە گـەوهەر دەدروشانەوە ، باوەشیان بەیەکداکرد و زمانی ڕۆحی ئەم ودەمی ڕۆحی سکرتێرەکە بەیەکگەیشتن ٠

ـ سـێکسی ژێر گـۆمی شـەراب چەنـد خـۆشە ، شـەرابی ووزە بـەخش لەگـەڵ هەمـوو تەکـانێکدا ، لەگـەڵ هەمـوو خـونچـە مـاچێکی دەمی سکرتێـرەکـەدا ، قـومێ شـەرابی دەنۆشی و ووزەو و ئارەزووی زیاتری گڕی دەگرت . دوای چەند جار تەواو بوون ، وەک دووپەڕە گوڵ ووردە ووردە سـەر ئاو کـەتن . لەسـەر چیـمـەنی تەنیـشـت گـۆمـەکـە و لە ژێر تیــشـکی خــۆرێکی خــۆشــدا پاڵ کــەوتن وســەرو قــژە زەردە تـەڕە شەراباویەکەی لە سەر سنگە تووکاوێکەی هەڵخستبوو .لە دەروون و چەستەیەکی ئارامدا دەژیا . چاوەکانی چوە خەوێکی ئارامەوە وخەوت پاش کەمێک بەئاگا هاتەوە بەتەنیا بوو و سکرتێرەکەی لەتەنیشتەوە نەمابوو ترس بووە موچرکەیەک و لەشی لەرزان

( کارێکی خراپم کرد .ئۆف خوایە پەشیمانم ، نەمزانی ئەو سکرتێرە فــەلەیەو من مــوســوڵـمــان ، تۆبە خــوایە لێم ببــورە ، چیــمکرد، پەشیمانم) ٠

دەنگە ناسکە کە وەڵامیدایەوە
ـ کاریکی خراپت نەکردووە .تۆ لە بەهەشتایت . خوا مرۆڤەکان وەک یەک دروست دەکات . جیاوازی ئاینەکان ، جیاوازی ویاسای دواکەوتووی مرۆڤە هی خوا نیە ، سیکسی نێوان مرۆڤەکانی ئاینە جیاوازەکان حەرام نیە . خوا یاسای جیاوازی سێکسی لە نێوان مرۆڤەکاندا دانەناوە ، چۆن جیاوازی لە نێوان ڕەش و سپی ، زەردا دانەناوە ئاواش مافی سێکسی داوە بەگشت مرۆڤەکان سێکسی بە پارە ولاقەکردن و بە زۆر حەرامە .چۆن مرۆڤ دیاری خوا ( ئارەزوو) بە پارە دەفرۆشێ و دەکرێ ؟ . هەر کەسێک ئەم بازارە دروست بکات تاوان بارە . مرۆڤ هەر مرۆڤە یاسای خوا یاسای انسانیە جیاوازی لەنێوان ڕەش و سپی و فەلەو موسوڵمان و زەردەشتی و جودانیە. ئێوەن ئەم هەڵەیە دەکەن وئەم جیاوازیە دروست دەکەن ! .
بەسەر گردۆڵکەیەکی کوڕدا و بەناو قەرسیل و چیمەنی پڕ گوڵدا شۆڕبووە هەنگاوی دەنا. پێی بە سەرهەرگوڵ وگێایەکدا بنایە کە پێی لا دەبرد ، گوڵ و گیاکانی ژێر پێی زیت دەبوونەوە ٠
(لەم بەهەشتەدا هیچ شتێک هیچ کەسێک نامری و هیچ شتێک نافەوتێ . هەموو شتێک لێرە بوونی هەیە ، چەوسانەوە نەبێ ، بێکاری و غەمی پارە و چاوچنۆکی و برسێتی جیاوازی چینەکان ومرۆڤەکان ڕەنگەکان نەبێ . هەموو کەسێک بێجیاوازی ڕەگ و ڕەنگ وڕەگەز مافی بەختیاریان هەیە ) ٠
بە دەم خەیاڵەوە لە سەربزنە ڕێی شاخ و داخێکی سەخت خۆی بینیەوە .گڕەی گەرمایەک لە جەستەی ئالاّ ٠
( ئەم ناوچەیە و ئەم گڕەیە لە هی باشوری کوردستان دەچی . هەردەڵێی گڕەی شارباژێرە . بەردە خڕە هەڵچنراوەکانی قەیەغەی نێوان زەویەکان ، دارسیوەکوڵە بنەکان ، ڕەزە پەرشبووەکانی شارباژێرە چۆن گەیشتمە ئێرە ـ ئێرە کوردستانە ) ٠
لە دوورەوە لە ژێر دارسێوێکی کورتە بنەدا ، ئافرەت و پیاوێکی بینی

جەوەندەیە ئاو بە لقێکی دارسێوەکەدا هەڵواسرابوو. ووردوورد تکە ئاوی لێدەتکاو دەخزایە سەرزەویەکە . زەویەکەش وەک دەمی تینوێتی کردبێتەوە لە چاوتروکاندنێکدا تکە ئاوەکانی هەڵدەمژی . سەبەتەیەک تریّ و سێوە لاسورە لە تەنیشتیانەوە لەتەک چارۆکە نانێکی تیری و چامیّ ماست و قۆریەکی ڕەش هەڵهاتوو. دوو پیاڵە تەلخ و مستیّ شەکری کلّۆی لەسەردانرابوو. پیاوەکە کلاوێکی دەستچنی ڕەنگاو ڕەنگی لەسەر دابوو، جامەنەکەی لەمل ئالابوو لاقێکی کربووە دۆشەک و لاقێکی کردبووە پالّ پشتی پشتی ئافرەتێکی خرپنی بالاّ مامناوەندی و لەباوەشی گرتبوو. دەمیان لە نێو دەمی یەکتری دانا بوو خەریکی هەڵمژینی زمان وهەڵگلۆفتنی مەمکە قنجەکانی بوو. کۆڵوانەکەی پشتی ئافرەتەکە لارکەوتبوو پشتە سمتێکی خرپنی ژێر کراسێکی تەنکی گولگولّی دەرخست بوو. پیاوەکە توند بەخۆیەوە نووساندبوو. لە خۆشی ماچەکان شان وملی یەکتریان هەڵدەگلۆقی . هەڵوێستەیکی کرد وشەرم دایگرت . ویستی ڕێچکەی ڕۆیشتنەکەی بگۆڕیّ .

ـ نا ..نا ئەو ژیانە ڕۆمانسیە جوانەتان لیّ تێک نەدەم .

هێزیک پالّی بەهەنگاوەکانیەوە دەناو بەرەو ژن و پیاوەکە دەیبرد . لێیان نزیک بووە ئەوانیش سەریان لەیەک جیابۆوە ، ڕوویان تێکرد. ئافرەتەکە لە کۆشی پیاوەکە هاتەخوارەوە و چەند هەنگاوی لیّ نزیک کەوتەوە وبەرامبەری وەستا . ئافرتێکی لادێی تەمەن بیست سالان و کورتەبنەیەکی خرپن . ڕوویەکی خڕی گۆشتن ، دووچاوی قاوەیی پڕکل دوولێوی ناسک ، ڕیزێک دانی سپی برنجی . قژێکی ڕەشی خاوی شانە کراوکە بەتەوقەیەک چەند چلّ ڕێحانەی ڕەشی پێوە قایمکردبوو . ملوانکەیەکی مێخەک و یاقووتی شینی بەسەر دوومەمکی قنجی هەڵتۆقیوی بێمەمکەوانەی ژێر کراسێکی کوردی دا هەڵواسی بوو . چەپکە تیشکێکی لە چاوەکانی دا

لە جێگەی خوی سربوو .

ـ تیشکی ئەم چاوانە بەڕۆحم ئاشنایە ؟
ئافرەتەکە چەند هەنگاویکی تر لێی نزیک بۆوە و ئەم هەر لە جێگەی خۆی چەقی بوو. چاوە ڕەشەکانی پڕ بوون لە ئاو وبەگەرمی و سۆزێکی زۆرەوە باوەشی پێدا کردو توند بەسنگ ومەمکیەوە نوسان (بۆنی سملّ و ڕێحانەو ئەم قژ ولەشە بە ڕۆحم نامۆنیە ) زەنگی هەستی ڕایچلّەکاند و( لە بۆنی دایکم دەچێ ) هێشتا لەباوەشی ئافرەتەکەدا بوو وەلاّمی خوێدایەوە ٠
(نا ، دایکم هێندە جوان نەبوو دایکم ئافرەتێکی پیری بێدان وکۆماوە و لاواز و داماوی ماندوو بوو. چاوەکانی کزبوون . لە بێخی مووەکانیەوە تاکۆتایی دواچلّی مووەکانی سەری سپی بوون مەمکەکانی وەک دووپارچە پێست ئاسایی بەسنگە ڕەقەکەیەوە هەلّواسرابوون . نۆ مندالّ شیری لێخوارد. هێندە دلّسۆز بووبۆمان ئامادەبوونەک شیری مەمکەکانی بەلّکو تەڕایی و خوێنی لەشیمان بداتێ٠
( ئای دایە گیان کە میهرەبان بوویت ) ٠
لە بۆن و هەستی باوەشی گەرمی ئافرەتەکەدا تاسابوو . ئافرەتە لادێیکە دلّی پەنجەکانی بەڕویداهێنا و دەستی خستە ناو قژەکورتەکەیەوە ٠
(ئەم دەست هانینەش هەر لەهی دایکم دەچێ ) (ئای خوایە گیان ئەم ئافرتە چەند مهرەبانە ) . پیاوەکە هەربە دانیشتنە و تێیدەڕوانین و زەردەخەنەی بە ڕووی دیمەنەکەدا دەبەخشی و چاوەگەشاکانی ئاوی تێزابوو. ئافرەتەکە هەردوو لێوە قاوەیی یە پڕ خوێنەکەی کرد بەیەک و ماچێکی لاملی کرد، چاوە پڕکلەکانی پڕبوون لە فرمێسکی خۆشەیستی وچاویان بەرامبەری یەکتر قەدیس مابوو ٠
ـ کوڕی شیرینم ... نام ناسیتەوە ؟
بروسکەیەک لەهەناوی دا .... چەند سالّە کەس ئەم ڕستەیی پێ نەوتووە . واقی وڕمابوو و نەیدەزانی چۆن وەلاّمی بداتەوە .

ـ کوڕە شیرینەکەم من دایکتم .
سەری هێنایە پێشەوە و ماچێکی تریکرد ٠
ـ دایە تۆ ... ئا ... تۆ ئەوەندە جوان و گەنج و...و.....و....و
ـ کوڕم تۆ منت بەپیری دیوە. وەلی من بەپیری لەدایک نەبووم . ئەی نازانی مرۆڤی بەهەشتی کە دەمرێ ، لەبەهەشتا بۆ تەمەنی لاوی یان ئەو تەمەنەی دڵی دەیخوازی زیندوو دەبێتەوە ؟ . خوای گەورە داخوازی هەموو مرۆڤەچاکەکان جێبەجێدەکات .
دەستە خرپنە پڕ بازنە شوشەییەکەی کردە ملی ٠
ـ بەقوربانت بم دایەگیان . ئۆخەی جارێکی تر بینیمیتەوە . سوپاس بۆ خوای گەورە ومهرەبان . دایەگیان زۆر شەرمەزارم لێم ببورە کە بەجێمهێشتی دایەگیان بەپاکی خۆت بمبەخشە ، بێوەفا بووم وهەر بیرم لەخۆم دەکردەوە . ئەو هەموو خۆشەویستیەت دامێ من بەجێم هێشتی٠
باوشیان بەیکداکرد و پرقەبارەی سیەکانی بۆنی سنگی دایکی هەڵدەمژی ٠
(ئای کەخۆشە ئەم بۆنە دایەگیان ، وەرە باسیەکانم پڕبێ لە بۆنت . ئۆف دایەگیان ، چەند باوەشێکی بەسۆز ودڵێکی مهرەبانت هەیە. هەردووکیان ئاوڕیان لە پیاوەکەی بن دارسێوەکە دایەوە و ئەویش بە سۆزێکی زۆرەوە بۆ ئەو دیمەنە دەگریا و فرمێسکەکانی بەناو تووکەکانی ڕیشیدا دەخزانە ناو سمێڵە ئەستورە ڕەشەکەیەوە.
دایکی ووتی :
ـ کوڕە شیرینەکەم دەزانی ئەو پیاوە کێیە ؟!
ـ نەدایە گیان ، تۆ ئازادی ، تۆکەسێکی ژیانێکی زۆرت کرد بەقوربانی من و خوشک و براکەم . دوای مردنی باوکم ئارەزوەکانت خنکاند، تا چاوی چەقۆئاسایی خەڵکی جەرگت نەبڕێ . ئەو پیاوە هەر کەسێک بێ پیرۆزت بێ ، نا دایە گیان نایناسم ، بەڵام چاوەکانی پڕن لە مهرەبانی ، لە سۆز و خۆشەویستی وئاوات بەرامبەرم کێیە ئەو

مــرۆڤــەی تۆی وا بەســۆزەوە لەباوەشگرتووە ؟ ئەو ژیان و دیمــەنە جوانەی من دیم دڵخۆشی کردم ، پیرۆزت بێ دایە مهرەبانەکەم ٠
دایە گیـان ، زۆر دڵشـادم کە تۆ وەکو من تەنیا نیت . ئاخ تەنیـایی و غـوربەت زۆر ناخۆشـە ، سەختە ، نەگبەتی یە . دایە گیـان ئەو پیـاوە هەرکەسێک بێت پیرۆزت بێ . من دڵخۆشم کە بەدڵخۆشی دەتبینم و وا بە سۆزەوە لە باوەشی گرتوویت ٠
دایکی دەستی گرت و هەردووکیان لەپیاوەکە نزیک کەوتنەوە .
ـ کوڕە بچکۆلە هەتیوەکەم.... ئەو پیاوە باوکتە !
ـ باوکم ؟! .
ـ ئا ... کـوڕە شـیـرینەکـەم تۆ وباوکت یەکـتـریـتـان نەدیوە . کـاتێک باوکت مرد ، تۆ لە سکمدا شەش مانگان بوویت ، ئا کوڕم وەرە ئەوە باوکتە . ئەو دارسێوەش ئەو دارسێوەیە کەلەگەڵ باوکتا یەکەم ماچ ویەکەم ژووانمان لە بنیاکرد . بۆیە ئێستاش هەموو ڕۆژێک لێرەدا ژیان بەسەر دەبەین . بن ئەم دار سێوە خۆشترین ژووانی ژیانمان بوو ، نامانەوێ کاڵ ببێتەوە !
هەرسێکیان دایانە پڕمەی گریان و بە پڕتاو باوەشیان بەیەکدا کردتێر ڕیشە نەتاشراوەکەی باوکی ماچکرد ٠
ـ ئۆخەی باوکە گیان ! بۆیەکەمجار بۆنی سەرسنگتم هەڵمژی . باوکە گیان تۆ نازانی بێ باوکی چ کەلێنێکی لەژیانم کرد . لەم تەمەنەشدا حەزم لەبۆنی هەناسەو دەنگتە ، بابە گیان قسە بکە ، تا تامەزرۆی بێ باوکی چل ساڵەیم دەشکێ . ئای کەناخۆشە منداڵ بێ ناز وسۆزی باوک گەورەبێ ؟!
باوکیشی بەسۆزەوە باوەشی پێداگرت وبەسەر یەکدا گریان .
ـ ئۆخەی ڕۆڵە هەتیوەکەم ، جەرگە شیرینەکەم ، سوپاس بۆ خوای گەورەو مهرەبان ئاواتی هەموومانی هێنایە دی ٠
هەرسێکیان باوەشیان بەیەکدا کردبوو و بۆنی یەکتریان دەکرد ومەست ببوون . لەناکاو دەنگی دووسەگی بەگژایەکچوو دەستی دوو پیرەژن

بەئاگای هێنایەوە . سەری لەناو ئەژنۆکانی دەرهێنا و سەیرێکی ئەم لاو لای خۆیکرد . نە دایک نە باوکی ، نەگۆمە شەراب ونەسکرتێری جوان و نەمیوەی ناسک و نە هەوای پاک و نەبۆنی خۆشی گوڵ وگوڵزار . نە ئارامی ، نە سرپەی ماچ ونە ئۆفی حەز . هاژە هاژی ئۆتۆمۆبێل و بۆنی دووکەڵی ئۆگزۆز و دەنگە دەنگی شەمەندەفەر نەبێ.

ئەژنۆەکانی سڕبوون . کەمێک ڕاستیکردنەوە و بە ئاستەم خۆی جوڵاند و هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا .

دەستێکی بەڕووە زیبکاویەکەیداهێنا :

( خەیاڵێکی خۆش بوو ) .

(ڕاستە کە مرۆڤ لە ئاست گرفتەکانی ژیاندا بێ توانا دەبێ پەنا دەباتە بەر خوا ) .

پێش بەچاپگەیاندنی ئەم ڕۆمانە کەسانێکی
دڵـــــسۆز ڕەخنـــــەو ســــــەرنج و کۆمــــــەکیــــــان
پێـــــــــکرم ، زۆر بەدڵـــــــەوە ســـــوپاســیـان دەکـەم .